# ڕێزمانی کوردی



## (کرمانجی سەروو)

پرۆفیسۆری یاریدەدەر
**د.نەریمان خۆشناو**

چاپی یەکەم/ ٢٠١٥

* ناوی کتێب: ڕێزمانی کوردی (کرمانجی سەروو)
* نووسینی: پ.ی.د.نەریمان عەبدوللا خۆشناو
* تایپێست: نووسەر
* دەرهێنانی هونەری: خلیل هدایت مام شێخ
* شوێنی چاپ: یەکەم ٢٠١٥
* شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەلات/ هەولێر(٤٦٣٩٥٣١)
* تیراژ: ١٠٠٠ دانە
* نرخ: (٤٠٠٠) دینار
* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٥٠٦)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە.



**لە بلاوکراوەکانی ناوەندی ئاوێر**

**ژمارە(٢٥٦)**

**ناوەرۆک**

پێشەکی........................................................٤
هەندێ لایەنی جیاوازیی دەنگیی..............................٦
نێر و مێ....................................................١٣
ئامرازی دانەپاڵ............................................٢٤
نـــاو..........................................................٢٨
جـێـنــاو.....................................................٥٥
ئاوەڵناو......................................................٧٥
کار.............................................................٩٠
ئاوەڵکار....................................................١١٥
ژمارە.........................................................١٢٤
پێشبەند (پریپۆزیشن)....................................١٣٢
ئامرازی سەرسوڕمان و بانگکردن.........................١٣٧
بکەرنادیار....................................................١٤١
سەرچاوەکان.................................................١٤٦

# پێشەکی

زمانی کوردی بەسەر چوار زاری سەرەکی دابەشبووە، و هەر زارێکیش چەندین شێوەزاری لەخۆوە گرتووە، ئەمڕۆکە لە باشووری کوردستان دوو زار، کرمانجی سەروو و کرمانجی ناوەڕاست و لەنێو کرمانجی سەروو، شێوەزاری بادینی، و لە کرمانجی ناوەڕاستیش، شێوەزاری بابانی بوونەتە زمانی نووسین و زمانی دامودەزگاکانی حکوومەت، ئەگەرچی کرمانجی ناوەڕاست زیاتر زاڵترە و شێوەی زمانێکی باڵای وەرگرتووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت نکۆڵی لەوە بکەین، کە کرمانجی سەرووش لە دەڤەری بادینان، بەتایبەتی لە پارێزگای دهۆک، زمانی دامودەزگای میرییە و زمانی پەروەردە و خوێندنە.

بەو واتایەی ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە و پێمان خۆشبێت یان ناخۆش، ئەمڕۆکە لە باشووری کوردستاندا زمانی کوردی خاوەنی دوو زمانی ستانداردە!، ئەوانیش کرمانجی سەروو و کرمانجی ناوەڕاست، بۆیە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەم دوو زمانە زۆر گرنگە.

لە ماوەی ڕابوردوودا چەندین نووسین و کتێبمان لەسەر کرمانجی ناوەڕاست بڵاوکردۆتەوە، بۆیە وا دەخوازێ لەمە بە دواوە ئیشەکانمان بۆ کرمانجی سەرووش تەرخانبکەین، ئەمیش بۆ زیاتر خزمەتکردنی زمانەکەمانە، چونکە جگە لە دەڤەری بادینان، ئەمڕۆ لە پرۆگرامی خوێندنی شارەکانی تری کوردستان(هەولێر، سلێمانی،

کەرکووک) ئاماژە بە هەندێ لایەنی ڕێزمانی کرمانجی سەروو لە کتێبی ڕێزمانی کوردیدا دەکرێت، کە بەداخەوە تاڕادەیەک کێشە و گرفتی بۆ مامۆستایان و قوتابییان دروستکردووە، ئەمیش بەهۆی شارەزانەبوونیان یان کەم شارەزاییان لە ڕێزمانی کرمانجی سەروو، بۆیە ئەم ڕێزمانەی ئێمە سەرەتایەکە بۆ ئاشنابوون بە چەند لایەنێکی ڕێزمانی کرمانجی سەروو، بەو هیوایەی لە داهاتوودا کاری باشتر و پوختری بۆ بکەین.

**پرۆفیسۆری یاریدەدەر**

**د.نەریمان عەبدوللا خۆشناو**

**هەولێر٢٠/٧/٢٠١٥**

# هەندێ لایەنی جیاوازیی دەنگیی

# نێوان کرمانجی سەروو و کرمانجی ناوەڕاست

بۆ ئەوەی لە لایەنە دەنگییەکانی کرمانجی سەروو زیاتر شارەزا بین، پێویستە لە دەستپێکدا هەندێ خاسیەت و تایبەتمەندیی لایەنی دەنگیی کرمانجی سەروو بە بەراورد لەگەڵ کرمانجی ناوەڕاست بخەینەڕوو[1]:

١ـ لە کۆتایی و ناوەڕاستی هەندێ وشەدا، لە کرمانجی سەروو (ی) بەرانبەر بە (وو) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:

| کرمانجی سەروو | کرمانجی ناوەڕاست |
| --- | --- |
| پاری | پاروو |
| خانی | خانوو |
| ئارەزی | ئارەزوو |
| خاتین | خاتوون |
| ئاڤری | ئابڕوو |

١ـ بۆ زیاتر شارەزابوون بۆ ئەم دیاردانە، بڕوانە ئەم دوو سەرچاوەیە: ا- ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦، ل ٦٤ ـ ٦٧.ب ـ دولبەر ئیبراهیم فەرەج شاڵی، یاسای دەنگییەکانی زمانی کوردی، نامەی ماستەر، بەشی کوردی ـ کۆلیژی زمان ـ زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٠.

٢. لە کۆتایی هەندێ وشەدا، لە کرمانجی سەروو (وو) بەرانبەر بە (ی) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:

| کرمانجی سەروو | کرمانجی ناوەڕاست |
|---|---|
| تووژ | تیژ |
| شوور | شیر |

٣. لە هەندێ وشەدا، لە کرمانجی سەروو (ڤ) بەرانبەر بە (و) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:

| کرمانجی سەروو | کرمانجی ناوەڕاست |
|---|---|
| چاڤ | چاو |
| شەڤ | شەو |
| هاڤین | هاوین |
| سێڤ | سێو |
| هەڤیر | هەویر |
| ئاڤا | ئاوا |

٤. لە زۆر وشەدا، لە کرمانجی سەروو (ە) بەرانبەر بە (بزرۆکە i) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:

| کرمانجی سەروو | کرمانجی ناوەڕاست |
|---|---|
| قەنج | قنج |
| چەنگ | چنگ |
| کەچ | کچ |

٥. لە زۆر وشەدا، لە کرمانی سەروو (**بزرۆکە i**) بەرانبەر بە (ە) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:

| کرمانجی سەروو | کرمانجی ناوەڕاست |
|---|---|
| هل | هەڵ |
| هنەک | هەندێک |
| در | دەر |
| دکت | دەکات |
| ب | بە |
| ک | کە |

٦. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، زۆرجار دەنگی ***/ش/*** تێدەچێت، لە بەرانبەردا لە کرمانجی ناوەڕاستدا دەمێنێتەوە، هەروەکو لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

| کرمانجی سەروو | کرمانجی ناوەڕاست |
|---|---|
| فرۆتن | فرۆشتن |
| ڕێتن | ڕێشتن |

٧. لە هەندێ وشەدا، لە کرمانجی سەروو (هـ) بەرانبەر بە (و) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:

| کرمانجی سەروو | کرمانجی ناوەڕاست |
|---|---|
| هشک | وشک |
| هشیار | وشیار |

| | |
|---|---|
| هرچ | ورچ |
| هور | ورد |

٨ـ لە هەندێ وشەی کرمانجی سەروودا، **(ص، گ)** بەرانبەر بە **(س، ت)** لە کرمانجی ناوەڕاستدا دەوەستێ، وەک:

| **کرمانجی سەروو** | **کرمانجی ناوەڕاست** |
|---|---|
| صار[1] | سارد |
| صۆر | سوور |
| طەڤر | تەور |
| طاوە | تاوە |

٩ـ لە هەندێ وشەدا، پاش و پێش کردن(**جێگۆڕکێ**)ی پیت دەکرێت، وەک:

| **کرمانجی سەروو** | **کرمانجی ناوەڕاست** |
|---|---|
| بەرف | بەفر |
| تەزرە | تەرزە |
| جینار | جیران |
| خیز | زیخ |

---

[1]ـ ئەمڕۆکە لە زمانی نووسینی کرمانجی سەروودا، زیاتر (س) لەجیاتی (ص) و (ت) لەجیاتی (گ) بەکاردەهێنرێت، بەو واتایەی (ص، گ) زیاتر لە ئاخاوتن هەستی پێ دەکرێت نەک لە نووسین، چونکە ئەمڕۆکە (سار) لەجیاتی (صار) و (تەڤر) لەجیاتی (گەڤر) بەکاردەهێنرێن.

| | |
|---|---|
| نک | کن |

١٠- لە هەندێ لەو **(چاوگ)** و **(قەدی چاوگ)** و **(ناو)** و **(ئاوەڵناو)**انەی لە کرمانجی ناوەڕاستدا دەنگی/د/یان تێدایە، لە بەرانبەردا لە کرمانجی سەروودا نین، وەک:

| | **کرمانجی ناوەڕاست** | **کرمانجی سەروو** |
|---|---|---|
| **چاوگ** | خواردن | خارن |
| **چاوگ** | بردن | برن |
| **چاوگ** | کردن | کرن |
| **قەدی چاوگ** | خوارد | خار |
| **قەدی چاوگ** | برد | بر |
| **قەدی چاوگ** | کرد | کر |
| **ناو** | ئارد | ئار |
| **ئاوەڵناو** | زەرد | زەر |
| **ئاوەڵناو** | سارد | سار |

١١- لە دیالێکتی کرمانجی سەروودا، (ڵ)ی قەڵەو نییە، لە بەرانبەردا لە کرمانجی ناوەڕاستدا یەکجار زۆرە، وەک:

| **کرمانجی سەروو** | **کرمانجی ناوەڕاست** |
|---|---|
| هلچوون | هەڵچوون |
| خال | خاڵ |

| | |
|---|---|
| هەڤال | هەڤاڵ |

١٢- لە دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاستدا، دەنگی(ڤ) زۆر کەمە، لە بەرانبەردا لە کرمانجی سەروودا یەکجار زۆرە، وەک:

| **کرمانجی سەروو** | **کرمانجی ناوەڕاست** |
|---|---|
| ڤالابوون | واڵابوون |
| چاڤ | چاو |
| هاڤین | هاوین |

١٣- لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، بەهۆی کارتێکردنی دوو دەنگی کپ لەسەر یەکتری، دەنگی */ف/* تێدەچێت، هەروەکو لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

**سەرکەفتن ← سەرکەتن**

**پێشکەفتن ← پێشکەتن**

**ژێکەفتن ← ژێکەتن**

**دەرکەفت ← دەرکەت**

١٤- زۆرجار لە کرمانجی سەروودا، بۆ مەبەستی ئاسانی دەربڕین و بەهۆی کارتێکەری دەنگەکانی دەوروبەر، دەنگی */ڤ/* تێدەچێت، وەکو:

**ئیڤرۆ ← ئیرۆ**

**کەڤچک ← کەچک**

**زڤستان ← زستان**

١٥. هەندێ جار لە دیالێکتی کرمانجی سەروودا (وی)، لە بەرانبەردا لە کرمانجی ناوەڕاستدا(وو) بەکاردێ، وەک:

| کرمانجی سەروو | کرمانجی ناوەڕاست |
| --- | --- |
| ئەستویر | ئەستوور |
| دویر | دوور |

# نێر و مێ

ڕەگەز دوو جۆری هەیە، سروشتی و ڕێزمانی، سروشتی نەگۆڕە، بەڵام ڕەگەزی ڕێزمانی لە زمانێک بۆ زمانێکی تر یان لە ناوچەیەک بۆ ناوچەیەکی تر دەگۆڕێت، بەجۆرێ لە هەندێ زماندا بەپێی نیشانە تایبەتییەکانی ڕێزمانی، ڕەگەزی ناوەکە دەستنیشان دەکەن، بە نموونە ناوی (ڕۆژ) لە زمانی فەرەنسیدا لە ڕەگەزی نێرە، بەڵام لە زمانی عەرەبی و دیالێکتی کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا مێیە،[1] کەچی لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا ناوێکە لە ڕەگەزی بێلایەن.

لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا، دەمێکە نیشانەی تایبەتی ڕەگەزی نێر و مێ لەناوچووە، تەنیا لە یەک حاڵەتدا ماوە، ئەویش لە دۆخی بانگکردندا، بەجۆرێک لەم دۆخەدا نیشانەی تایبەتی هەیە بۆ جیاکردنەوەی نێر و مێ، کە بەمشێوەیەی خوارەوەیە:

ا ـ نیشانەی (ە) بۆ تاکی نێر بەکاردێت، وەک:

---

[1] ـ مزگین عەبدولڕەحمان ئەحمەد(٢٠٠٦)، دۆخی ئێرگەتیڤ لە زمانی کوردیدا (کرمانجی سەروو)، نامەی ماستەر، بەشی کوردی کۆلێژی پەروەردە بۆ زانستە مرۆڤاتییەکانی زانکۆی سەلاحەددین، ل٤٩.

**ـ کوڕە، بخوێنە.**

ب ـ نیشانەی (ێ) و (ە) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەک:

**ـ کچێ، دانیشە.**

**ـ دایکە، وا دەڕۆم بۆ بازاڕ.**

**ـ خوشکە، ئاگات لە خۆت بێ.**

ج ـ نیشانەی (ینە) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێت، وەک:

**ـ ئەی کوڕینە یخوێنن.**

**ـ ئەی کچینە وەرنە قوتابخانە.**

کەچی لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، ئەگەرچی بەهۆی کرداری بیستنەوە ڕەگەزی نێر و مێ لەیەکتر جیادەکرێنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی نیشانەی تایبەتییەوە جیاوازی نێر و مێ دەکرێت، واتە بەهۆی نیشانەی ڕیزمانی تایبەتییەوە ڕەگەزی نێر و مێ جیادەکرێنەوە. ئەم جیاوازی کردنەش بەهۆی نیشانەی ڕەگەز و ئامرازی دانەپاڵ و جێناو و ئاوەڵناو و دۆخی بانگکردنەوە دەبێت، هەروەکو لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

**١. بەهۆی نیشانەی تایبەتی ڕەگەزەوە**

لێرەدا نیشانەی (ی) بۆ ڕەگەزی نێر و نیشانەی (ێ) بۆ ڕەگەزی مێ بەکاردێت و دەچێتە سەر ناوەکەوە، بەو واتایەی ناوەکە بەهۆی ئەم نیشانانەوە دەناسرێت، وەکو:

- بەفرینێ ئاڤ فەخار.
- شڤانی گول چاندن.
- نەوزادی پەیامەکا خۆ دا نەسرینێ.
- هێلینێ ب کێرکێ دەستێ خۆ بڕی.
- ڕزگاری پەرتوکێن پێدڤی کڕین.

له کرمانجی سەروودا بۆ ژەمەکانی خواردن ناوی تایبەتی هەیە و بەکاردێت، بەو واتایەی وەک کرمانجی ناوەڕاست تەنیا وشەی (نان) بۆ هەموو ژەمەکانی نانخواردن بەکارنایێت، بەڵکو بۆ هەر ژەمێکی نانخواردن ناوێک بەکاردێت، بەمشێوەیەی خوارەوە:

بۆ ژەمی بەیانی : چێشت(تێشت) بەکاردێت.

بۆ ژەمی نیوەڕۆ : ڤراڤین بەکاردێت.

بۆ ژەمی بەیانی : شیڤ بەکاردێت.

**٢. بەهۆی ئامرازی دانەپاڵ(دۆخی تیان)**

کاتێک دوو وشە بەهۆی ئامرازی دانەپاڵەوە دەدرێنە پاڵ یەکترییەوە، ئەوە ئامرازەکانی دانەپاڵ بۆ نێر و مێ و تاک و کۆ جیاوازییان لەنێواندا هەیە، کە بەمشێوەیەن:

ا- ئامرازی دانەپاڵی (ا) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەک:

**- کچا نەسرینێ هات.**

ب - ئامرازی دانەپاڵی (ێ) بۆ تاکی نێر بەکاردێت، وەک:

**- کوڕێ ئازادی هات.**

ج - ئامرازی دانەپاڵی (ێد، ێن، ێت) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێت، وەک:

**- چیایێت کوردستانێ بلّندن.**

**- کوڕێد مە عەگیدن.**

**- دارێد چیایان مەزنن.**

**- ماسیێد دەریایان خوشن.**

**٣. بەهۆی جێناو**

**ا. جێناوی کەسی سەربەخۆ**

لە کۆمەڵە جێناوی (من - مە)، لە کەسی سێیەمی تاکدا جیاوازی لە نێوان نێر و مێدا دەکرێت، بەمشێوەیە:

وی/ جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی تاکی نێر، وەک:

**- وی شیڤ خار.**

وێ/ جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی تاکی مێ، وەک:

**- وێ شیڤ خار.**

**ب - جێناوی نیشانە:**

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، حەوت جێناوی نیشانەمان هەیە، کە بۆ تاک، کۆ، نێر، مێ، نزیک، دوور بەکاردەهێنرێن. جێناوەکانیش بەمشێوەیەی خوارەوەن:-

**ئەڤە:** بۆ تاکی نزیک بەکاردێت.

**ئەڤە پسمامێ منە.**

**ئەڤە هەڤالێ منە.**

**ڤی:** بۆ تاکی نێری نزیک بەکاردێت.

**ڤی نەگرە.** [1]

**ڤی چێشت خار.**

**ڤێ:** بۆ تاکی مێی نزیک بەکاردێت.

**ڤێ شیڤ خار.**

**وی:** بۆ تاکی نێری دوور بەکاردێت.

---

[1]- صادق بهاءالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی – کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری، چاپا یەکێ، زانکۆی سەلاحەدین، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، ١٩٨٧، ل ١٣٧.

**وی چیرۆک نڤیسی.**

**ویَ:** بۆ تاکی مێی دوور بەکاردێت.

**ویَ چیرۆک نڤیسی.**

**(ئەڤان) ڤان:** بۆ کۆی نێر و مێی نزیک بەکاردێت.

**ڤان گۆڤەندەکا خۆش گرێدا.**

**(ئەوان) وان:** بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێت.

**وان ڕەشبەلەک گرێدا.**

**٤. ئاوەڵناوی نیشانە:**

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا فۆرمەکانی ئاوەڵناوی نیشانە لەگەڵ ناوی تاک و کۆ و نێر و مێ بەشێوەی جیاواز بەکاردێن، بەمشێوەیەی خوارەوەن:

**ئەڤ....... ە:** لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی نێر و مێی نزیک بەکاردێ.

**- ئەڤ کتێبە یێ مەیە.**

**ڤی........ ی:** لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی نێری نزیک بەکاردێ.

**- ڤی خورتی سەریَ مە بلندکر.**

**ڤێ.........یَ:** لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی مێی نزیک بەکاردێ.

**- ڤێ قوتابییَ وانە باش خواند.**

**وی.........ی:** لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی نێری دوور بەکاردێ.

**- وی ڕەزڤانی ڕەزیَ خۆ فرۆت.**

**وێ.......... ێ:** لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی مێی دوور بەکاردێ.

**- وێ گۆتنێ دلێ مە خۆشکر.**

**ڤان(ئەڤان)........ان:** لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی نێر و مێی نزیک بەکاردێ.

**- ڤان گولان بچینە.**

**وان(ئەوان)...........ان:** لەگەڵ ناوێک بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

**- وان جوتیاران زەڤیێن خۆ کێلان.**

**تێبینی:** بۆ ئاسانی جیاکردنەوەی جێناو و ئاوەڵناوەکانی نیشانە لە ڕووی نزیکی و دوورییەوە، دەکرێت ئەم ڕێگەیە ئاسانە بگرینەبەر، ئەویش (ڤ) بۆ نزیک و (و) دوورە، واتە هەموو ئەو جێناو و ئاوەڵناوە نیشانانەی بە (ڤ) دەستپێدەکەن، بۆ نزیک بەکاردێن، بەڵام هەموو ئەو جێناو و ئاوەڵناوە نیشانانەی بە (و) دەستپێدەکەن، بۆ دوور بەکاردێن.

### ٥. دۆخی بانگکردن

لە حاڵەتی بانگکردندا، چەند نیشانەیەک بە ناوەوە دەلکێن، بەهۆیانەوە ڕەگەزی ناوەکە دیاری دەکرێت، نیشانەکانیش بریتین لە:

أ. نیشانەی (ە) و (ۆ) بۆ تاکی نێر بەکاردێت، وەک:

**- کورە، وەرە نک مە.**

**- کورۆ، بخوینە داسەرکەڤی.**

ب - نیشانەی (ێ) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەک:

**- کچێ، رونیشە.**

**- خویشکێ، چێلێ بدۆشە.**

**- خویشکێ، مالا خوە ژبۆ مێهڤانان بەرهەڤ بکە.**

ج - نیشانەکانی (ینە) و (ا) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێت، وەک:

**- کورینە هەڕن دابچینە زانکۆیێ.**

**- گەلی کورکا هەڕن دابچینە زانکۆیێ.**

**- گەلی کچا(کەچکا) هەڕن دابچینە زانکۆیێ.**

لەگەڵ ئەوەشدا (**سادق بەهائەدین ئامێدی**) لە کتێبی (**ڕێزمانا کوردی**)[1]دا، چەندین حاڵەتی دیاریکراو بۆ جیاکردنەوەی نێر و مێ دەستنیشان دەکات، بۆیە لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

١- ئەگەر دار و درەخت وشک و ڕەق بێت، ئەوە نێرە، وەک: (**دارێ گوێزێ**)، (**دارێ سێڤی**)، بەڵام ئەگەر دارەکە تەڕ و سەوز بێت، ئەوە مێیە، وەک: (**دارا گوێزێ**)، (**دارا سێڤی**).

---

[1]- بڕوانە: أ. صادق بهاءالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی – کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری، چاپا یەکێ، زانکۆی سەلاحەدین، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، ١٩٨٧، ل١٧٦ـ ١٧٧. ب - موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی، دەستوری شیکردنەوە لە زمانی کوردیدا، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری ئاسۆی پەروەردەیی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٨، ل٥٨ ـ ٦٠.

٢ـ بواری ئاوەدانی وەک (**خانوو**، **باڵەخانە**، **بازاڕ**، **شار**، **شارۆچکە**، **شارەدێ**، **گوند**، **کاول**، **دیوار**، **بان**..) لە ڕەگەزی نێرن، وەک: (**خانیێ مەزن**)، (**خانیێ دە ئۆدە**)، بەڵام (**گەڕەک**، **کوچە**، **ئەشکەوت**) لە ڕەگەزی مێن.

جێگەی ئاماژەپێکردنە لێرەدا (**سادق بەهائەدین**) نەیتوانیوە جیاوازی لەنێوان وشەی (**خانی ـ خانوو**) و (**ماڵ**) بکات، چونکە لە کرمانجی سەروودا وشەی (**خانی ـ خانوو**) نێرە، بەڵام وشەی (**ماڵ**) مێیە، واتە (**خانی ـ خانوو**) بە شێوە و هەیکەلەکە دەوترێت و لە ڕەگەزی نێرە، بەڵام (**ماڵ**) کە کەلوپەلی تێدایە و شوێنی ئاوەدانی و ژیانی تێدایە، دەبێتە ڕەگەزی مێ.

٣ـ هاوارکردن و قیژەکردن مێیە، وەک (**هاوارا دوی گورگی**).

٤ـ هەموو ئەستێرەکانی ئاسمان، جگە لە (**تەرمی نویحێ**)، هەمووی لە ڕەگەزی مێن.

٥ـ هەرچی نزمی و دەشتایی لەسەر ڕووی زەوی هەیە، جگە لە (**گەلی**)، هەمووی لە ڕەگەزی مێن.

٦ـ هەموو ئاوی سەر ڕووی زەوی (**دەریا**، **زەریا**، **جۆگە** و **جۆبار....**) لە ڕەگەزی مێن، جگە لە (**ڕووبار**، **چەم**، **ئۆقیانوس**) لە ڕەگەزی نێرن.

٧ـ هەرچی میوە و بەرهەمی دار و درەختە(**جگە لە ترێ**) لە ڕەگەزی مێن.

٨ـ هەموو چاوگەکانی زمانی کوردی لە ڕەگەزی مێن.

٩ـ هەموو ناوێکی واتایی لە ڕەگەزی مێیە.

١٠ـ ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ (**سەر**، **گوێ**، **دەم**، **چاو**، **مل**، **ددان**، **زمان**، **سینگ**، **گەروو**) لە ڕەگەزی نێرن، بەڵام ئەندامەکانی (**دەست**، **پێ**، **پەنجە**، **لووت**، **دڵ**، **لێو.....**) لە ڕەگەزی مێن.

١١ـ ئامێرەکانی (**داس**، **قەیناخ**، **خاکەناس**، **بێڵ**) لە ڕەگەزی مێن، جگە لەمانە هەموو ئامێرەکانی تر لە ڕەگەزی نێرن.

١٢ـ هەموو دەشت و دەشتاییێک لە ڕەگەزی مێیە، وەک: (**دەشتا بتوێنێ**)،(**دەشتا شەهرەزورێ**).

١٣ـ هەموو چیاییێک لە ڕەگەزی نێرە، وەک: (**چیایێ مەتینا**)،(**چیایێ قەندیلی**)، بەڵام (**تەپۆڵکە**، **شاخ**، **لوتکە....**) لە ڕەگەزی مێن.

١٤ـ چەکی شەڕکردن و بواری جەنگ (**تیر**، **کەوان**، **موشەک**، **تانک**، **فڕۆکە.....**) لە ڕەگەزی مێن.

١٥ـ خشڵ و زێڕی ئافرەتان هەمووی مێن، جگە لە (**بازن و گوارە**) بە تاک دەبێتە نێر.

١٦ـ جلوبەرگی لەبەرکردن و لەپێ کردن، وەک (**کڵاو**، **کراس**، **پەستەک**، **ڕانک**، **چۆغەر**، **بێجامە**، **کەوا**) لە ڕەگەزی نێرن، ئەوانی دیکە وەک (**پشتوێن**، **پێڵاو**، **شاڵ**، **دەسماڵ**) هەمووی لە ڕەگەزی مێن.

١٧ـ هەموو شتێكی دەوری زەوی لە چینی هەوای ئاسمان لەگەڵ ڕەشەبا و ئاسمان لە ڕەگەزی نێرن، بەڵام (**بەفر، باران، تەزرە، باهۆز، لافاو، زوقم، شەونم، شێ، تەمومژ، تەڕایی**) لە ڕەگەزی مێن.

١٨ـ ئامێرەكانی بواری نووسین (**پێنووس، مەرەكەب**) لە ڕەگەزی نێرن، بەڵام (**دەفتەر، پەرتووک، تەباشیر، كتێب.....**) لە ڕەگەزی مێن.

١٩ـ شتی سەرەكی خوێندن (**پۆل، تەختەڕەشە، مێز....**) لە ڕەگەزی نێرن، بەڵام ئەوانی دیكە وەک (**كورسی، كتێبخانە..**) لە ڕەگەزی مێن.

# ئامرازی دانەپاڵ

لە زمانی کوردیدا، جگە لە زاراوەی ئامرازی دانەپاڵ، زاراوەکانی **(تیان، خستنەپاڵ، خستنەسەر، ئیزافە)ش** بەکاردێن، کە هەر هەموویان هەمان مەبەست دەگەیەنن.

ئامرازی دانەپاڵ، بەو ئامرازانە دەوترێت، کە دوو وشە دەخەنە پاڵ یەکترییەوە، بەهۆیەوە گرێیەک (فرێزێک) دروست دەکەن، واتە ناوێک دەخاتە پاڵ ناوێک، یان ناوێک دەخاتە پاڵ جێناوێک، یان ناوێک دەخاتە پاڵ ئاوەڵناوێک، یان جێناوێک دەخاتە پاڵ ئاوەڵناوێک، یان دوو ئاوەڵناو دەخاتە پاڵ یەکتری یان.......هتد.

لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا (ی) ئامرازی سەرەکی دانەپاڵە و دوو وشە دەخاتە پاڵ یەکترییەوە، ئینجا ئەم دوو وشەیە تاک بن یان کۆ، یان نێر بن یان مێ،.........هتد، و یاساکانی سازکردنیشی بەمشێوەیەی خوارەوەیە:

١ـ ناو + ی + ناو

کوڕ + ی + ئازاد

ـ کوڕی ئازاد زیرەکە.

٢ـ ناو + ی + جێناو

کوڕ + ی + ئەو

**- کوڕی ئەو هات.**

٣- ناو + ی + ئاوەڵناو

کچێک + ی + جوان

**- کچێکی جوان ڕۆیشت.**

٤- جێناو + ی + ئاوەڵناو

ئێوە + ی + تیکۆشەر

**- ئێوەی تێکۆشەر سەردەکەون.**

٥- ئاوەڵناو + ی + ئاوەڵناو

باڵابەرز + ی + چاوشین

**- من کچێکی باڵابەرزی چاوشینم بینی.**

هەروەها ئامرازی دانەپاڵ دەکرێ چاوگیش بداتە پاڵ ناو یان جێناو یام ئاوەڵناو، جا چاوگەکە دیارخەر بێ یتن دیارخراو. وەک:

**- نووسینی تۆم بەدڵە.**

**- نووسینی باش بنووسە.**

**- تاوانی کوشتن، گەورەیە.**

هەروەها هەر لە کرمانجی ناوەڕاستدا، هەندێ جار لە جێگەی ئامرازی دانەپاڵی (ی)، ئامرازی دانەپاڵی (ە) بەکاردێت، لەوکاتەی کە ئامرازی ناسراوی لەسەر ناو لادەچێ و دەچێتە سەر ئاوەڵناو، بەڵام هەر بۆ ناوەکە دەگەڕێتەوە، وەک:

**- کوڕە زیرەکەکە هات.**

**- کچە جوانەکە ڕۆیشت.**

بۆیە هەندێجار ئەوە دەوترێت، کە لە کرمانجی ناوەڕاستی زمانی کوردیدا (ی) وەک ئامرازی دانەپاڵ لەگەڵ ناوی نەناسراو بەکاردێ، بەڵام (ە) لەگەڵ ناوی ناسراو بەکاردێ.

بەڵام لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، ئامرازەکانی دانەپاڵ لە ڕووی تاک و کۆ و نێر و مێ جیاوازییان تێدەکەوێت، کە بەمشێوەیەی خوارەوەن:

١. نیشانەی (ا) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەک:

کچ + ا + ڕزگاری

**- کەچا ڕزگاری زیرەکە.**

کەچ + ا + تە

- کەچا تە هات.

کەچ + ا + جان(جوان)

**- کەچا جوان چوو.**

٢. نیشانەی (ێ) بۆ تاکی نێر بەکاردێ، وەک:

کور + ێ + ڕزگار

- کورێ ڕزگاری هات.

کور + ێ + من

**- کورێ من زیرەکە.**

کور + ێ + زیرەک

- کورێ زیرەک سەردکەڤی.

٣. نیشانەکانی (ێد، ێن، ێت) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێن، وەک:

کور + ێد + مە

چیا + ییێت + کوردستان

چاڤ + ێن + تە

- کورێد مە زیرەکن.

- چیاییێت کوردستانێ بلندن.

- پێشمەرگێن کوردستانێ سەرکەفتن.

- چاڤێن تە جوانن.

# نـــاو(ناڤ)

بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، وشەیەک دەگرێتەوە کە بەسەر گیاندارێک یان بێگیانێک یان بیرێک یان ڕووداوێک دادەبڕێ، واتە دەبێتە هۆی دیاریکردنی.

## جۆرەکانی ناو

**١. ناو لە ڕووی ژمارەوە**

لە ڕێزمانی کوردیدا ناو لە ڕووی ژمارەوە بەسەر تاک و کۆ دابەش دەکرێ، بەم شێوەیە:

**أ. ناوی تاک**

بەو ناوانە دەوترێ کە بۆ تاکە کەسێک یان بۆ تاکە شتێک بەکاردێت. وەکو:(**کوڕ، کچ، ژن، چەقۆ، چرا...........هتد**).

**ب . ناوی کۆ**

بەو ناوانە دەوترێ کە بۆ کۆمەڵە کەسێک یاخود کۆمەڵە شتێک بەکاردێن. لە زمانی کوردیدا لە دوو شت یان دوو کەس زیاتر بێ، دەبێتە کۆ. لە زمانی کوردیدا بە هۆی نیشانەی تایبەتییەوە ناوێک لە تاکەوە دەگۆڕدرێ بۆ کۆ.

لە كرمانجی سەرووی زمانی كوردیدا، لەپاڵ ئەوەی كە ناوی تاك بەهۆی نیشانەی **(ان)** كۆ دەكرێتەوە، بەڵام هەندێ جار تەنیا بە **(ا)** ناوەكە كۆ دەكرێتەوە، واتە (ن) تێدەچێ و ناهێتە گوتن و نڤیسین، وەك:

**ژن← ژنان، ژنا**

**مرۆڤ← مرۆڤان، مرۆڤا**

**مامۆستا← مامۆستایان، مامۆستایا**

لە هەمان كاتیشدا لە كرمانجی سەروودا ڕێگەی تریش هەن، بۆ ئەوەی بزانین كە ناوەكە كۆیە، لەوانە:

- بەهۆی ئامرازی دانەپاڵی (ێد، ێت، ێن)، وەك:

- **چیایێن كوردستانێ بلندن.**

لێرەدا بەهۆی (ێن) زانراوە ناوەكە كۆیە.

- بەهۆی نیشانەی كۆ(ن)، بەجۆرێ سەیری كارەكە دەكەین، دەزانین تاكە یاخود كۆ، بە نموونە وشەی(هەسپ) لەنێو ڕستەدا بەبێ ئەوەی وشەكە هیچ نیشانەیەكی پێوە لكا بێت، دەزانین كە تاكە یان كۆ، ئەمیش بە سەیركردنی كاری ڕستەكە، وەك:

- **هەسپ هات.** لەم نموونەیەدا (هەسپ) تاكە، ئەمیش بە سەیركردنی كاری (هات) بۆمان دەركەوتووە.

ـ **هەسپ هاتن.** لەم نموونەیەدا (هەسپ) کۆیە، ئەمیش بە سەیرکردنی کاری (هاتن)، کە (ن)ی خراوەتە سەر، بۆمان دەرکەوتووە.[1]

**٢. ناو لە ڕووی ناسینەوە**

لە زمانی کوردیدا ناو لە ڕووی ناسینەوە بەسەر ناوی ناسراو و ناوی نەناسراو دابەش دەکرێت:

**أ . ناوی ناسراو:**

بەو ناوانە دەوترێت، کە قسەکەر و گوێگر زانیارییان لەبارەوە هەیە، کەسێکە ناسراوە یان شتێک هەیە کە لایان ناسراوە.

لە زمانی کوردیدا بە چەندین شێوە ناو دەبێتە ناسراو:

١ـ بەهۆی نیشانەی (ەکە) یان هەندێ جار بە نیشانەی (ە) ناو دەبێتە ناسراو. ئەم نیشانەیە دەچێتە سەر بەشی دواوەی ناو و لە نەناسراوەوە دەیکات بە ناسراو، وەکو:.

**کەچ + ەکە ← کەچەکە**

**چرا + ەکە ← چراکە (بە تێچوونی بزوێن)**

**چرا + ەکە ← چرایەکە (پەیدابوونی نەبزوێن)**

**برا + ەکە ← براکە – برایەکە**

---

[1] ـ باقێ نازێ(٢٠١٢)، رێزمانا کوردی (تیوری و پراکتیک)، چاپخانەی هەوار، دهۆک، ل٦٥ ـ ٦٦.

لێرەشدا دەبێ ئاگاداری پیتی بزوێن و پیتی نەبزوێن بین، چونکە بەهۆی بوونی پیتی بزوێن لە کۆتایی وشەوە، گۆڕانکاری ڕوودەدات، هەروەکو لەم نموونانەی سەرەوەدا دەرکەوتووە.

٢- بەبێ نیشانەی (ەکە)، کە ئەمیش لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا ناو دەبێتە ناسراو:

أ- هەموو ناوی تایبەتی ناسراوە، وەکو ناوی مرۆڤ (**ئەحمەد، ڕزگار، ڤیان، شیرین.........**)، ناوی وڵات (**عێراق، ئێران،.....**)، ناوی هەرێم (کوردستان، باسک،....)، ناوی شار(**هەولێر، دهۆک،......**)، ناوی شارۆچکە (**قەڵادزێ، سۆران،.....**)، ناوی شارەدێ (**عەنکاوە، سەنگەسەر،.....**)، ناوی لادێ (**سوورەدێ، گردجۆتیار،...**).

ب - ئەگەر ناوێک بەهۆی ئاوەڵناوی نیشانەوە دەست نیشان بکرێت، ئەوە ئەو ناوە دەبێتە ناوی ناسراو، وەک:

**- ڤێ قوتابیێ هۆزانەک ڤەهاندیە.**

لێرەدا وشەی (**قوتابی**) ناوێکی ناسراوە، چونکە بەهۆی ئاوەڵناوی نیشانەی (**ڤێ**........**ێ**) دەست نیشانکراوە.

**ب ـ ناوی نەناسراو:**

بەو ناوانە دەوترێت، کە قسەکەر و گوێگر زانیارییان لەبارەوە نییە، کەسێکە نەناسراوە یان شتێک هەیە کە لایان نەناسراوە. واتە

بەو ناوانە دەوترێت کە بۆ حاڵەتی نەناسراوی بەکاردێن، ناوی نەناسراویش هەندێ جار بەهۆی نیشانەی نەناسراوی دروست دەبێت، نیشانەی نەناسراویش (ەک)ە، کە دەچێتە بەشی دواوەی ناوەکە، هەندێ جاریش بەبێ نیشانە، ناوەکە خۆی نەناسراوە.

کور + ەک ← کورەک

**- کورەک هاتە ماڵا مە.**

کەچ + ەک ← کەچەک

**- کەچەک هاتە مالا مە.**

چرا + ەک، ێ، ێک ← چرایەک

**- چرایەک ڤەمرینە.**

ئەگەرچی زۆر بە کەمی نیشانەکانی (**ێک** ، **ێ**) بەکاردێت، وەک:

**کور + ێک، ێ= کورێک ، کورێ**

**٣. ناو لە ڕووی ڕەگەزەوە**

لە زمانی کوردیدا ناو لە ڕووی ڕەگەزەوە، بەسەر ناوەکانی (نێر، مێ، دوولایەن، بێلایەن) دابەشدەکرێ، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**أ. ناوی نێر:** بەو ناوانە دەوترێت کە بۆ ڕەگەزی نێر بەکاردێن، کە بەم شێوەیەی خوارەوەن :

**ناوی تایبەتی کوڕان:** لەزگین، شێرزاد، شێرکۆ...... هتد.

**ناوی کەسانی نێرینە:** باوک، خاڵ، مام، کوڕ، پسمام.....هتد.

**ناوی گیانلەبەری نێر:** دیکل، هەسپ، یەکانە، نێری.......هتد.

**ناوی پیشەی پیاوان:** نانبێژ، فیتەر، گۆشتفرۆش، شڤان، خزمەتکار، گاڤان.........هتد.

**ب ـ ناوی مێ:** بەو ناوانە دەوترێت کە بۆ ڕەگەزی مێ بەکاردێن، کە بەم شێوەیەی خوارەوەن:

**ناوی تایبەتی کچان:** ڤیان، نێرگز، نەمام، هێرۆ...هتد.

**ناوی کەسانی مێ:** دایک، خویشک، خاڵۆژن، کچ، دۆتمام،.....هتد.

**ناوی گیانلەبەری مێ:** مریشک، ماهین، مالۆس، بزن......هتد.

**ناوی پیشەی کچان:** نانکەر، تەشی ڕێس، بەربوویک.....هتد.

دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە پێشتر وشەی (جلشۆر) پێشتر وەک ناوێکی مێ و بۆ پیشەی کچان بەکاردەهات، بەڵام ئێستا بۆتە ناوێکی بێلایەن.

**پ ـ ناوی بێلایەن:** بەو ناوانە دەوترێت کە ڕەگەزی نێر و مێیان نییە. وەک: **(دار، بەرد، ئاسن، ئاگر، گوڵ..........هتد).**

هەرچەندە لە زمانی کوردیدا دەیەها ناو هەن کە لە بنەڕەتدا ناوی بێلایەنن و لە ڕیزی ناوی بێلایەن دانراون، بەڵام لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا ناوی بێلایەن بەهۆی بەکارهێنانییەوە یان دۆخی دانەپاڵیدا دەگۆڕدرێت و بەهۆیەوە بۆ ڕەگەزی نێر یان مێ بەکاردەهێندرێن، بەو واتایەی ناوی بێلایەن لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا بوونی نییە، چونکە کە بەکاردەهێنرێن، ڕەگەزەکەی

دیاری دەکرێت، بە نموونە (شێر)، ڕەگەزی نێر و مێی بەهۆی ئامرازی دانەپاڵەوە جیادەکرێنەوە:

**- شێرا من (بۆ ڕەگەزی مێ)**

**- شێرێ من ( بۆ ڕەگەزی نێر)**

**ج - ناوی دوولایەن:** بەو ناوانە دەوترێت کە بۆ هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ بەکاردێن.

وەک: **(قوتابی، مامۆستا، کەو، هرچ، سەگ،......هتد).**

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، بەهۆی زیادکردنی پەیڤی (مێ/ ما، نێر، دێهل،...هتد) و ئامرازی دانەپاڵ ڕەگەزی ناوەکە دیاری دەکرێت[1]، وەکو:

| ناو | نێر | مێ |
|---|---|---|
| کەو | کەوێ نێر | کەوا مێ(مێ کەو) |
| کەر | کەرێ نێر | کەرا مێ |
| سەهـ(سە) | سەهـ - سەیێ - گەمبولە نێر | دێهل - دێلک |
| سیخور | سیخورێ نێر | سیخورا مێ |
| هرچ | نێرە هرچ | هرچا مێ |

---

١- جەلادەت ئالی بەدرخان، ئەلفابێیا کوردی و بنگەهێن گرامەرا کورمانجی، ڤەگوهاستن ژ تیپێن لاتینی: مەسعود خالد گولی، چاپخانەی خەبات، دهۆک، ٢٠٠١، ل ٦٦ - ٦٧.

| | | |
|---|---|---|
| فیل | فیلێ نێر | فیلا مێ |
| کەڤرۆشک | کەڤرۆشکێ نێر | کەڤرۆشکا مێ |

هەروەها لە کرمانجی سەروودا هەندێ ناو بەرچاو دەکەون، کە ئەگەرچی لە ڕیزی ڕەگەزی دوولایەن دادەنرێن، وەک ناوەکانی **(هەڤال، سەرکار، دژمن، دۆست، بەرخ، کار، گۆلک، پشیک، کاڤر...هتد)**، کەچی لە دۆخی دانەپاڵیدا بەهۆی نیشانەی مۆرفۆلۆژییەوە دەکرێن بە نێر یان مێ، بەجۆرێک کاتێ نیشانەی (ێ)یان دەچێتەسەر، ئەوە ناوەکە دەبێتە ناوی مێ، بەڵام ئەگەر نیشانەی (ی)یان بچێتە سەر، ئەوە ناوەکە دەبێتە نێر، وەک:.

**- ئەزێ بەرخێ چێرینم.(من بەرخی مێ دەلەوەڕێنم).**

**- ئەزی بەرخی چێرینم.(من بەرخی نێر دەلەوەڕێنم).**[1]

هەروەها لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا وەکو پێشتر وتمان جیاوازی نێر و مێ دەکرێت، ئەم جیاوازی کردنەش بەهۆی نیشانەی ڕەگەز و ئامڕازی دانەپاڵ و جێناو و ئاوەڵناوەوە دەبێت، هەروەکو لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

---

[1]- ئەوڕەحمانی حاجی مارف(د)(١٩٧٩)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی یەکەم (ناو)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، ل ١٨٣.

**١. بەهۆی نیشانەی تایبەتی ڕەگەزەوە**

لێرەدا نیشانەی (ی) بۆ ڕەگەزی نێر و نیشانەی (ێ) بۆ ڕەگەزی مێ بەکاردێت و دەچێتە سەر ناوەکەوە، بەو واتایەی ناوەکە بەهۆی ئەم نیشانەوە دەناسرێت، وەکو:

**- ئازادی شیڤ خار.**

**- نەسرینێ شیڤ خار.**

**٢. بەهۆی ئامرازی دانەپاڵ:**

کاتێک دوو وشە بەهۆی ئامرازی دانەپاڵ لێکدەدرێن، ئەوە ئامرازەکانی دانەپاڵ بۆ نێر و مێ و تاک و کۆ جیاوازییان لە نێواندا هەیە، بەمشێوەیە:

ا- ئامرازی دانەپاڵی (ا) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەک:

**- کچا نەسرینێ چوو.**

ب - ئامرازی دانەپاڵی (ێ) بۆ تاکی نێر بەکاردێت، وەک:

**- کورێ ئازادی زیرەکە.**

ج - ئامرازی دانەپاڵی (ێد، ێن، ێت) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێن، وەک:

**- چیایێت کوردستانێ بلندن.**

**٢. بەهۆی جێناو:**

**ا. جێناوی کەسی سەربەخۆ:**

لە کەسی سێیەمی تاکدا، لە کۆمەڵە جێناوی (من ـ مە) جیاوازی لە نێوان نێر و مێدا دەکرێت، بەمشێوەیە:

وی/ جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی تاکی نێر، وەک:

ـ وی نان خار.

وێ/ جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی تاکی مێ، وەک:

ـ وێ نان خار.

**ب ـ جێناوی نیشانە:**

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، حەوت جێناوی نیشانەمان هەیە، کە بۆ تاک، کۆ، نێر، مێ، نزیک، دوور بەکاردەهێنرێت، جێناوەکانیش بەمشێوەیەی خوارەوەن[1]:-

ئەڤە ← بۆ تاکی نزیک بەکاردێت.

ـ ئەڤە پسمامێ منە.

ـ ئەڤە هەڤاڵی منە.

ڤی ← بۆ تاکی نێری نزیک بەکاردێت.

ـ ڤی زارۆکا ماچی دکەت.

---

١ـ لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی، چاپی سێیەم، چاپخانەی ئەکاسیا، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٨٢ – ٨٣.

ڤێ ← بۆ تاکی مێی نزیک بەکاردێت.

**- ڤێ گول چاندن.**

وی ← بۆ تاکی نێری دوور بەکاردێت.

**- وی چیرۆک نڤیسی.**

وێ ← بۆ تاکی مێی دوور بەکاردێت.

**- وێ چیرۆک نڤیسی.**

(ئەڤان) ڤان ← بۆ کۆی نێر و مێی نزیک بەکاردێت.

**- ڤان گۆڤەندەکا خۆش گرێدا.**

(ئەوان) وان ← بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێت.

**- وان ڕەشبەلەک گرێدا.**

**٤. ئاوەڵناوی نیشانە**

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا فۆرمەکانی ئاوەڵناوی نیشانە لەگەڵ ناوی تاک و کۆ و نێر و مێ بەشێوەی جیاواز بەکاردێن، کە بەمشێوەیەی خوارەوەن:

ئەڤ.... ە ← لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی نێر و مێی نزیک بەکاردێ.

**- ئەڤ کتێبە یێ مەیە.**

ڤی....... ی ← لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی نێری نزیک بەکاردێ.

**- ڤی خورتی سەرێ مە بلند کر.**

ڤێ.........ێ ← لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی مێی نزیک بەکاردێ.

**- ڤێ قوتابیێ وانە باش خواند.**

وی........ی ← لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی نێری دوور بەکاردێ.

**- وی ڕەزڤانی ڕەزێ خۆ فرۆت.**

وێ.... ێ ← لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی مێی دوور بەکاردێ.

**- وێ گۆتنێ دلێ مە خۆشکر.**

ڤان(ئەڤان)........ ان← لەگەڵ ناوێک بۆ تاکی نێر و مێی نزیک بەکاردێ.

**- ڤان گولان بچینە.**

وان(ئەوان)........ان ← لەگەڵ ناوێک بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

**- وان جوتیاران زەڤیێن خۆ کێلان.**

**٤ . ناو لە ڕووی هەبوونەوە**

**١. ناوی ماددی(بەرجەستە):** بەو ناوانە دەوترێت کە بوونێکی سەربەخۆ و واقیعییان هەیە و بەر یەکێک لە هەستەکانی مرۆڤ دەکەون. بۆ نموونە: دار، پەنجەرە، کورسی، مێز...

**٢. ناوی واتایی (مەعنەوی):** ناوێکە خۆی لە خۆیدا بوونی سەربەخۆی نییە، بەڵکو لە هزر و خەیاڵدا پەیدا دەبێت و بەر هیچ یەکێک لە هەستەکانی مرۆڤ ناکەوێت، کە دەکرێت بەدوو جۆر:.

**أ. ناوی واتایی بنجی:** هەر خۆی لەبنەڕەتدا ناوێکی واتاییە و بۆ ئەم مەبەستە دانراون، وەکو: **شەرم، هێز، خەم، خەو، ڕەنج، جەنگ، دەروون، گیان، هۆش، بڕوا...هتد.**

دەبێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە ناوەکانی (**خەو، ڕەنج، جەنگ**) ڕەنگە لە بنەڕەتدا ناوی واتایی بنجی نەبن، چونکە ئەم وشانە ڕەگی کارن، لە چاوگەوە وەرگیراون، بەو واتایەی گەر بە نابنجییان دابنێین، هەڵە نابن.

**ب . ناوی واتایی نابنجی:** ئەو ناوانە لە بنەڕەتدا بەرجەستە(مادی)ن، بەڵام بەهۆی پاشگرەوە دەبنە ناوی واتایی، کە بەم جۆرە دێتە دروستکردن:.

**١. ناو + پاشگرەکانی (ی، ەتی ، ێنی، ینی، اتی، یی.......)= ناوی واتایی نابنجی**

هەولێر + ی= هەولێری

کورد + ینی = کوردینی

مێر + ینی = مێرینی

کچ + ێنی = کچێنی

برا + ەتی = برایەتی

هەڤال+ ینی = هەڤالینی

برا + یی = برایی

**٢. هاوەڵناو + پاشگرەکانی (ی، یەتی، یێتی، ایی، اتی، .....) = ناوی واتایی نابنجی**

أ. ئاوەڵناوی چۆنیەتی، وەک: ڕەشی، باشی، بلّندی، ئاشنایەتی، ئازایەتی، ڕەشاتی، شێتێتی، سەوزایی.

ب . ئاوەڵناوی بکەری دارِژاو، وەک: نڤیسەری، دانایی، زانایی.

جـ . ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو، وەک: گەشبینی، گیانبازی، سەرپەرشتیاری.

**٣. ڕەگی کار + پاشگری (ە) = ناوی واتایی نابنجی**

پرس + ە = پرسە

ناڵ + ە = ناڵە

**٤. قەدی چاوگ + پاشگری (ار) = ناوی واتایی نابنجی**

کر + ار = کرار

مر + ار = مرار

**٥- ڕەگی کار + پاشگری(ی) =ناوی واتایی نابنجی**

دز + ی= دزی

**٥. ناو لە ڕووی ناوەڕۆکەوە**

**١. ناوی گشتی:** بەو ناوانە دەوترێ کە بەسەر هەموو ناوێکی گیاندار یان بێگیانێک دادەبڕێ، کە خاوەنی یەک ڕەگەزن، بەو واتایەی کە

کەسێک یان شتێکی دیاریکراو پیشان نادات، وەکو: (**ڕووبار، چیا، دەشت، کوڕ، کچ، ژن، پیاو،.. هتد**). وەک:

**- وی کورەکێ گەلەک باشە.**

**- وی پیاوەکێ گەلەک باشە.**

**٢. ناوی تایبەتی:** بە ناوی گیاندار و بێگیانی دیاریکراو دەوترێت، بەو واتایەی کە کەسێک یان شتێکی دیاریکراو پیشان دەدات. وەکو:

**مرۆڤ/ ئازاد، ئەڤین، نەسرین.........هتد.**

**ڕووبار/ ئاراس، خابوور، دیجلە ..... هتد.**

**زێ/ بچوویک، گەورە، سیروان ....... هتد.**

**چیا/ سەفین، ئاسۆس، مەتین.......... هتد.**

وشەکانی (**ڕووبار، زێ، چیا**) ناوی گشتین، بەڵام وشەکانی (**ئاراس...، سیروان...، سەفین...**) ناوی تایبەتین. وەک:

**- شەرمین و شەڤین خویشکێن ئێکن.**

**- چیایێ هەڵگوردێ بەرزە.**

**٣. ناوی کۆمەڵ:** بەو ناوانە دەوترێت کە لە ڕواڵەتدا تاکن، بەڵام لە ناوەرۆکدا کۆن.وەک:

(**هۆز، عەشیرەت، لەشکر، چین، توێژ، دەستە، گروپ، چەپک، گاران....**)

**- چەپکێک گوڵم بۆ هاتووە.**

**- دەستەیەک پێنووسم بۆ بکڕە.**

**- لەشکری دوژمن بەڕێوەیە.**

**٦. ناو لە ڕووی پێکهاتنەوە**

**أ. ناوی سادە:** ئەو ناوەیە کە لە وشەیەکی واتاداری سەربەخۆ پێکدێت، بە مەرجێ ئەم وشەیە ناو بێت، وەکو: **هەور، دەست، ئازاد، ڕزگار، دار، ڕۆژ، چاڤ، ئاڤ، کەو،...هتد.**

**ب - ناوی دارِژاو:** بەو ناوانە دەوترێت، کە لە وشەیەکی سادە لەگەڵ پێشگرێک یاخود پاشگرێک یاخود هەردووکیان پێک دێت، بەم شێوەیەی خوارەوە:.

**١- ناوی سادە + پاشگر (گەر، ڤان، ساز، بەند، وان، چی، باز، مەند، ین، ستان، وەر ...هتد) = ناوی دارِژاو**

زیڤ + گەر = زیڤگەر

ڕەز + ڤان = ڕەزڤان

دار + ڤان = دارڤان

سەر + باز = سەرباز

نال + بەند = نالبەند

هونەر + مەند = هونەرمەند

چای + خانە = چایخانە

شەو+ گار = شەوگار

شەرم + ین = شەرمین

کورد + ستان = کوردستان

داد + وەر = دادوەر

هاڤین + گە = هاڤینگە

نێچیر + ڤان = نێچیرڤان

تێبینی/ زۆرجاران (دار، کەر) بە پاشگر دادەنرێن بۆ دروستکردنی وشەی داڕژاو، بەڵام وا نییە، چونکە:

**دار/** ئەم وشەیە واتادارە، چونکە لە بنچینەدا فارسییە، بە واتای (هەبوون) دێت، وەک:

**- پوول دارم.(پارەم هەیە)**

**- چ کار داری؟ (چ کارت هەیە)**

**کەر/** ئەم وشەیە واتادارە، شێوازی داڕشتنی بەمشێوەیە:

ڕەگی کردن(کە) + پاشگری(ەر)

نان + کەر = نانکەر

یاری + کەر = یاریکەر

**٢ـ ئاوەڵناوی سادە + پاشگر ( ی، یی، یەتی، ایەتی، ە، ایی، ێنە، انە.. هتد) = ناوی داڕژاو**

بڵند + ایەتی = بڵندایەتی

کرێت + ی = کرێتی

تووڕە + یی = تووڕەیی

مەرد + ایەتی = مەردایەتی

خراپ + ە = خراپە

پاک + انە = پاکانە

بەرز + یەتی = بەرزیەتی

سەوز + ایی = سەوزایی

زەرد + ێنە = زەردێنە

**٣. قەدی چاوگ + پاشگر = ناوی دارڕژاو**

گوت + ار = گوتار

کوشت + ار = کوشتار

دروو + مان = دروومان

کرد + ە = کردە

کوشت + ە = کوشتە

برد + ە = بردە

گرت + ە =گرتە

**٤- ڕەگی کار + پاشگر = ناوی دارڕژاو**

زان + ا = زانا

ناڵ + ە = ناڵە

نڤیس + ەر = نڤیسەر

پرس + یار = پرسیار

بێژ + ە = بێژە

پرس + ە = پرسە

**٥. ئاوەڵکاری سادە + پاشگر = ناوی دارِژاو**

بن + ار = بنار

پێش + ەوا = پێشەوا

سەر + ە = سەرە

ژێر + ە = ژێرە

دوور + ی = دووری

بن + ەوان= بنەوان

**٦. پێشگر + قەدی چاوگ = ناوی دارِژاو**

پێ + ویست = پێویست

**٧. پێشگر + ڕەگی کار = ناوی دارِژاو**

پێ + نووس = پێنووس

تێ + نووس = تێنووس

ب + گۆڕ = بگۆڕ

نە + بەز = نەبەز

لێ + زان = لێزان

ڕا + گر = ڕاگر

**٨. پێشگر + ڕەگی کار + پاشگر = ناوی دارِژاو**

پێ + خۆ + ەر = پێخۆر

تێ + بین + ەر = تێبینەر

ڕا + کە + ەر = ڕاکەر

ج ـ **ناوی لێکدراو:** بەو وشانە دەوترێت، کە لە دوو وشەی واتاداری سەربەخۆ یان زیاتر پێکدێت، بەم شێوەیە:

**١ـ ناوی سادە + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

دۆت + مام = دۆتمام

گوڵ + ئاڤ = گوڵاڤ

شا + هەنگ = شاهەنگ

مار + ماسی = مارماسی

ئاڤ + دەست = ئاڤدەست

**٢ـ ناوی سادە + و + ناوی سادە(هاوواتا) = ناوی لێکدراو**

ئاخ + و + داخ = ئاخ و داخ

ئاهـ + و + ئۆف= ئاهوئۆف

**٣ـ ناوی سادە + ناوبەند + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

ئاڤ + ە + ماست = ئاڤەماست

گوڵ + ە + گەنم = گوڵەگەنم

بەرد + ە + نوێژ = بەردەنوێژ

مانگ + ە + شەڤ = مانگەشەڤ

**٤ـ ناوی سادە + ئاوەڵناوی سادە = ناوی لێکدراو**

چاڤ + ڕەش = چاڤڕەش

**٥. ناوی سادە + ناوبەند + ئاوەڵناو = ناوی لێکدراو**

مێرگ + ە + سۆر = مێرگەسۆر

**٦. ئاوەڵناوی سادە + ناو = ناوی لێکدراو**

ڕەش + مال = ڕەشمال

سۆر + گول = سۆرگول

نەو + زاد = نەوزاد

کۆرە + مار = کۆرەمار

**٧. ئاوەڵناوی سادە + ناوبەند + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

ڕەش + ە + با = ڕەشەبا

کەڤن + ە + جلک= کەڤنەجلک

**٨. ناوی سادە + ڕەگی کار = ناوی لێکدراو**

دار + تاش = دارتاش

دڵ + خواز = دڵخواز

**٩. ناوی سادە + قەدی چاوگ = ناوی لێکدراو**

برا + زا = برازا

**١٠. ناوی سادە + ناوبەند + قەدی چاوگ = ناوی لێکدراو**

دەست + و + برد = دەستوبرد

**١١. قەدی چاوگ + ناوبەند + ڕەگی کار = ناوی لێکدراو**

هات + و + چۆ = هاتوچۆ(لێرەدا پەیدابوونی دەنگی ـ ۆ ـ ڕوویداوە)

مشت + و + مال =مشتومال

**١٢. ئاوەڵکار + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

پێش + نڤێژ = پێشنڤێژ

بەر + مال = بەرمال

**١٣. ئاوەڵکار + ناوبەند + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

پاش + ە + ڕۆژ = پاشەڕۆژ

**١٤. ناوی سادە + ناوبەند + وشەیەکی بێواتا= ناوی لێکدراو**

قەرز + و + قۆل = قەرزوقۆل

گول + و + مول = گولومول

**١٥. ناو + ناوبەند + ناو = ناوی لێکدراو**

گڤ + ە + گڤ = گڤەگڤ

چەق + ە + چەق = چەقە چەق

توت + ە + توت = توتەتوت

**١٦- وشەیەکی بێواتا + و + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

فڕ + و + فێل = فڕوفێل

گژ + و+ گیا = گژوگیا

**٧- ناو لە ڕووی ئەرکەوە:**

ناو لە ڕستەدا دەتوانێت ئەرک ببینێت، واتە دەتوانێت ببێت بە (بکەر، بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ، نیهاد، گوزارە، تەواوکەری ناو،......هتد).

**بکەر:** ناو کاتێ ئەرکی بکەر دەبینێ، ئەگەر کارێک ئەنجام بدات، چونکە بکەر کەسێکە یان شتێکە، هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی کارێک یاخود تەنها شوێنی بکەرەکە لە ڕستەدا پڕدەکاتەوە، وەکو:.

- **ڕێزانێ** چێشتەک لێنا.
- **شێرزادی** فیقی دخۆت.
- **پەنجەرەک** شکا.
- **ماستاڤ** ڕژا.
- **شیلانێ** چێشت خار.

بکەریش پێنج جۆری هەیە:

١. بکەری ڕێزمانی.
٢. بکەری لۆجیکی.
٣. بکەر دیار.
٤. بکەرنادیار.
٥. بکەر نادیاری ئاماژە پێکراو.

١-**بکەری ڕێزمانی:** بەو بکەرانە دەوترێت، کە تەنیا لە ڕووی ڕێزمانەوە بکەرن، واتە بکەری ڕاستەقینەی ڕستەکە نین، وەکو:

**ـ ماستاڤ ڕژا.**

**ـ گوندێ مە سۆت.**

**ـ پەنجەرەک شکەست.**

٢-**بکەری لۆجیکی:** بەو بکەرانە دەوترێت، کە لە ڕووی واتاوە کارەکانیان ئەنجامداوە، و بکەری ڕاستەقینەی ڕستەکەن، وەکو:

**ـ تریفە دێ خوێنیت.**

**ـ شێرزادی فیقی دخۆت.**

٣-**بکەر دیار:** بەو بکەرانە دەوترێت، کە لە ڕستەدا دەوریان هەیە و دەردەکەون، ئینجا بکەرەکە ڕێزمانی بێت یان لۆجیکی. وەکو:

**ـ نامەک ژبۆ مە هات.**

**ـ ئەحمەدی پەنجەرەک شکاند.**

**ـ ئەڤینێ چێشتەک لێنا.**

٤-**بکەر نادیار:** بەو بکەرانە دەوترێت کە لە ڕستەکەدا بوونیان نییە، یاخود دەرناکەون، وەکو:

**ـ سیڤ هاتە خارن.**

**ـ ڕزگار دهێته کوشتن.**[1]

**٥-بکەر نادیاری ئاماژە پێکراو:** بەو بکەرانە دەوترێت کە لە ڕووی ڕوخسارەوە ڕستەکان بکەریان نادیارە، بەڵام لە ڕووی ناوەرۆکەوە بکەریان لە شوێنێکی تری ڕستەکەدا دەرکەوتووە، بۆیە بەم جۆرە بکەرانە دەوترێت بکەر نادیاری ئاماژە پێکراو، وەکو:

**ـ ئازادی بدەستێ ڕزگاری هاتە کوشتن.**

**ـ بەنازێ لڕێگەی تریفەوە دهێتە هێنان.**

**نیهاد:** ئەرکێکە لە ئەرکەکانی ناو، وشەیەکە ڕوودانی کارەکە ئەنجام نادات، بەڵکو زیاتر سیفەتێکی دەدرێتە پاڵ. نیهاد کاتێک لە ڕستەدا پەیدادەبێت، ئەگەر کاری ناتەواو لە ڕستەکەدا هەبێت.

**کاری ناتەواو:** بەو کارانە دەوترێ کە بە تەنیا واتای ڕستەیان پێ تەواو ناکرێت، بەڵکو دەچنە پاڵ وشەیەکی ترەوە، کارە ناتەواوەکان لە زمانی کوردیدا لە چاوگی (بوون)ەوە وەرگیراون، کە بۆ هەر سێ حاڵەتی ڕابوردوو و ئێستا و داهاتوو بەکاردێن، بەم شێوەیەی خوارەوە:

(بوو) ← بۆ کاتی ڕابوردوو

---

١ـ بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی بکەر و جۆرەکانی، بگەڕێوە بۆ : نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، بکەر نادیار، سەنتەری ڕوناکبیری هەتاو، هەولێر، چاپخانەی شەهاب، ٢٠٠٧.

- **شێرزادی زیرەک بوو.**

کاری ناتەواوە بۆ کاتی ڕابوردوو

(ە) ← بۆ کاتی ئێستا

- **قوتابییەکە زیرەکە.**

کاری ناتەواوە بۆ کاتی ئێستا

ڕەگی (ب) بۆ کاتی داهاتوو، کە بەم شێوەیە:

دەبم ـــ دەبین

دەبیت ـــ دەبن

دەبێت ـــ دەبن

- **ڕزگاری دەبێت ب ئەندازیار.**

کارە ناتەواوەکان لە ڕووی هێزەوە تێنەپەڕن. بەڵام ئەگەر ئەم کارانە بە واتای (لەدایکبوون) یان (هەبوون)و (خاوەنداریتی) بێن، ئەوا لەم حاڵەتەدا دەبنە کارێکی تەواو، لە ڕووی هێزیشەوە لە هەردوو جۆری تێپەڕ و تێنەپەڕ دەبینرین، هەروەکو:

**ژنەکە منداڵی بوو.**

بکەر بەرکای ڕاستەوخۆ کاری ڕابوردووی تێپەڕە

**دارەکە شین بوو.**

بکەر کاری ڕابوردووی لێکدراوی تێنەپەڕە

**گوزارە:** وشەیەکە دەدرێتە پاڵ نیهاد، و هەمیشە کارێکی ناتەواوی لەگەڵدا دێت، واتە وشەکە دەبێتە تەواوکەری کارەکە و بەیەکەوە دەبنە گوزارە.

واتە: **تەواوکەری کاری ناتەواو+ کاری ناتەواو= گوزارە**

**خۆشتڤی + ە = گوزارە**

<u>دلڤین</u> <u>خۆشتڤییە</u>. (ە) کاری ناتەواوە بۆ کاتی ئێستا

نیهاد گوزارە

**بەرکای ڕاستەوخۆ:** ناو کاتێک ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆ دەبینێت، ئەگەر هاتوو کاری تێپەڕ لە ڕستەکەدا هەبێت.

<u>ئـــازادی</u> <u>نامەک</u> <u>نڤیسی</u>.

<u>تریفە</u> <u>ڤراڤین</u> <u>چێکردییە</u>.

بکەر بەرکاری ڕاستەوخۆ کاری تێپەڕ

**بەرکاری ناڕاستەوخۆ(تەواوکەری بەیارێدە):** ناو کاتێک لە ڕستەدا ئەرکی بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەبینێت، ئەگەر یەکێک لە پێشبەندەکانی(ب، ل، ژ، بۆ، ە) لەپێش بێت.

- وێ <u>ژ</u> <u>ئاگرێ</u> دترسیت.

پێشبەند بەرکاری ناڕاستەوخۆ

# جێناو(جێناڤ)

**چەمک و پێناسەی جێناو**

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی جێناو، هەندێ جار زاراوەکانی (**ڕاناو، بۆناو، جێناڤ، بەرناو، بەرناڤ، زەمیر.. هتد**) بەکاردێت، کە هەر هەموویان هەمان مەبەست و واتا دەگەیەنن، و لە کرمانجی سەروودا زیاتر زاراوەی (جێناڤ) بەکاردێت.

جێناو بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە لە جێی یان جێگەی ناوی کەسێک یان شتێک دێت و بەکاردێت، واتە دەبێتە جێگرەوەی ناو.

## جۆرەکانی جێناو

### جۆرەکانی جێناو لە ڕووی واتاوە

**١. جێناوی کەسی**

واتای کەسی گیاندار دەگرێتەخۆ، کە ئەوانیش قسەکەر و گوێگر و نائامادە دەگرێتەوە، جێناوە کەسییەکانیش دوو جۆرن:

**أ. جێناوی کەسی سەربەخۆ:**

ئەو جێناوانە دەگریتەوە، کە لە ڕواڵەتدا سەربەخۆن و واتای کەسی گیاندار دەگەیەنن، هەروەها واتای کەسەکە یان کەسەکان نیشان دەدەن و پەیوەندییان بە کەسانی دیکەوە ڕوون دەکەنەوە.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا دوو کۆمەڵە جێناو هەن، کۆمەڵە جێناوی **(ئەز ـ ئەم)** و کۆمەڵە جێناوی **(من ـ مە)**، بەکارهێنانی ئەم دوو کۆمەڵەیە بەم دوو شێوەیەی خوارەوەیە: ـ

١ـ کۆمەڵە جێناوی (ئەز ـ ئەم) لەگەڵ کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ بەکاردێن، بەمشێوەیەی خوارەوە:[١]

| کەسەکان | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | ئەز | ئەم |
| دووەم | تۆ | هوین (هوون) |
| سێیەم | ئەو | ئەو (ئەوان) |

بۆ کاری تێنەپەڕ، ئەرکی بکەر دەبینن، وەک:

- **ئەز هاتم.**
- **ئەز دێ هێم.**
- **ئەز دچم خوێندنگەهێ.**

---

١ـ ئیبراهیم ڕەمەزان زاخۆیی، ڕێزمانا کوردی، دەزگای سپیریز بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، دهۆک، چاپخانەی خانی، ٢٠٠٨، ل٧٨.

لەگەڵ کاری تێپەڕیش دێت، لەم حاڵەتەشدا ئەرکی بکەر یان بەرکاری ڕاستەوخۆ دەبینن:

- **ئەز دێ داری چینم.**

بکەر

- **ئەز تە دبینم.**

بکەر

- **وان هوین دیتن.**

بکەر

- **دوژمنی ئەز گرتم.**

بەرکاری ڕاستەوخۆ

زۆرجار لە کرمانجی سەروودا جێناوی سەربەخۆی(ئەز)، بەهۆی نیشانەکانی (ا، ێ) ڕەگەزی مێ و نێریان لە یەکتری جیادەکرێنەوە. واتە **(ئەزا)** بۆ مێ بەکاردێت و **(ئەزێ)** بۆ نێر بەکاردێت، بەم شێوەیە:

- **ئەزا دکەم.**
- **ئەزێ دکەم.**

هەر کاتێک کۆمەڵە جێناوی(ئەز ـ ئەم) بێت، ئەوە جێناوە لکاوەکان دەردەکەون.

- ئەز دکەم.
- تو دکەی.
- ئەو دکەت.
- ئەم دکەین.
- هوین دکەن.
- ئەوان(ئەو ـ هەو) دکەن.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا بۆ جیاکردنەوەی جێناوی (ئەو)ی کەسی سێیەمی تاک و جێناوی (ئەو)ی کەسی سێیەمی کۆ، ئەوە بەهۆی جێناوە لکاوەکانەوە لەنێو ڕستەدا جیادەکرێنەوە، بەمشێوەیەی خوارەوە:

- ئەو دهێت.
- ئەو دهێن.

لە نموونەی یەکەمدا جێناوی (ئەو) جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی تاک، چونکە لەگەڵ جێناوی لکاوی (ت)ی کەسی سێیەمی تاک بەکارهاتووە، بەڵام لە نموونەی دووەمدا، (ئەو) جێناوی سەربەخۆیە بۆ کەسی سێیەمی کۆ، چونکە لەگەڵ جێناوی (ن)ی کەسی سێیەمی کۆ بەکارهاتووە.[1]

---

١ـ عەبدولسەلام نەجمەدین و سەلوا فەریق، ڕێزمانا کوردی بۆ زارۆکان، دەزگای سپێرێز، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٦٥.

٢ـ کۆمەڵە جێناوی (من ـ مە)، تەنیا لەگەڵ کاری تێپەڕ بەکاردێن و ئەرکی بکەر و بەرکار دەبینن، جێناوەکانی ئەم کۆمەڵەیەش بەم شێوەیەی خوارەوەن:ـ[1]

| کەسەکان | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | من | مە |
| دووەم | تە | وە |
| سێیەم | وی ـ وێ | وان |

لەم نموونانەی خوارەوەدا جێناوەکان ڕۆڵی بکەر دەبینن.

- **من نڤیسی.**
- **وی/ وێ نڤیسی.**
- **من دوو دەفتەر ڤیان.**
- **مە گولێن جوان کرین.**
- **تە گول کڕی؟**
- **وە گۆت.**
- **وی چێشت خار.**
- **وێ چوو.**
- **وان دهێن.**

---

١ـ ئیبراهیم ڕەمەزان زاخۆیی، ڕێزمانا کوردی، دەزگای سپیریز بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، دهۆک، چاپخانەی خانی، ٢٠٠٨، ل ٧٩ – ٨٠.

هەروەها لەم نموونانەی خوارەوەدا کۆمەڵە جێناوی **(ئەز ـ ئەم)** ڕۆڵی بکەر دەبینن و کۆمەڵەی **(من ـ مە)** ڕۆڵی بەرکار دەبینن:

**ـ ئەز تە دبینم.**

**ـ تو من دبینی.**

**ـ ئەو وی دبینت.**

**ـ ئەم وە دبینین.**

**ـ هوین مە دبینن.**

**ـ ئەوان وێ دبینن.**

لەم نموونانەی خوارەوەدا کۆمەڵە جێناوی **(ئەز ـ ئەم)** ڕۆڵی بەرکار دەبینن و کۆمەڵە جێناوی **(من ـ مە)** ڕۆڵی بکەر دەبینن:

**ـ تە ئەز دیتم.**

**ـ من تو دیتی.**

**ـ وی ئەم دیتین.**

**ـ وان هوین دیتن.**

**ـ مە ئەوان دیتن.**

**ـ وە ئەو دیت.**

**ب ـ جێناوی کەسی لکاو:**

بەو جێناوانە دەوترێت، کە لە ڕواڵەتدا سەربەخۆ نین، بەڵکو بەشێوەیەکی لکاو بە کارێک یان ناوێک دەلکێن. ئەم جێناوانە لە ئاخاوتن و نووسیندا شوێن و جێگەی جێناوە کەسییە سەربەخۆکان دەگرنەوە. ئەو جێناوانە بە تەنیا هیچ مەبەستێک نە لە ئاخاوتن و نە لە نووسیندا بەدەستەوە نادەن، بەڵام کە لکان بە وشەکانی پێش خۆیانەوە، ئینجا مەبەست دەپێکن.[١]

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا تەنیا یەک کۆمەڵە جێناوی کەسی لکاومان هەیە، کە بەمشێوەیە[٢]:

| کەسەکان | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | م | ین |
| دووەم | ی | ن |
| سێیەم | ە، Ø، ت، یت، ەت | ن |

وەکو:

**ـ من دەستێ وی گرت.**

**ـ تە جۆت کر.**

---

١ـ لیژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی دووەمی ناوەندیی، چاپخانەی ئارام، بەغدا، ٢٠٠٧، ل ٤٥.

٢ـ محمد طاهر گوهەرزی، ڕێزمانا کوردی ـ زارێ کرمانجی، چاپخانەی خەبات، دهۆک، ١٩٩٩، ل ٧٧.

- **مەمۆ من دبە.**[1]

وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆی کرد، کە لەگەڵ کۆمەڵە جێناوی(**ئەز - ئەم**) جێناوە لکاوەکان زیاتر دەردەکەون، بەڵام لەگەڵ کۆمەڵە جێناوی (**من - مە**)، جێناوە لکاوەکان کەمتر دێن. وەک:

لەم نموونانەی خوارەوەدا لەگەڵ کۆمەڵە جێناوی(ئەز ـ ئەم) جێناوە لکاوەکان بەکاردێن:

- **ئەز دخۆم.**
- **تو دخۆی.**
- **ئەو دخۆت.**
- **ئەم دخۆین.**
- **هوین دخۆن.**
- **ئەوان(ئەو) دخۆن.**

لەم نموونانەی خوارەوەدا لەگەڵ کۆمەڵە جێناوی(من ـ مە) جێناوە لکاوەکان بەکارنایێن:

- **من خار.**
- **تە خار.**
- **وی/*وێ* خار.**

---

١. ڕەشید کورد، ڕێزمانا زمانێ کورمانجی، و: ئیسماعیل تاها شاهین، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٨، ل٧٣.

**ـ مە خار.**

**ـ وە خار.**

**ـ وان خار.**

لەم نموونانەی خوارەوەدا لەگەڵ کۆمەڵە جێناوی(ئەز ـ ئەم) جێناوە لکاوەکان بەکاردێن:

**ـ ئەز دنڤیسم(م).**

**ـ تو دنڤیسی(ی).**

**ـ ئەو دنڤیسیت(یت).**

**ـ ئەم دنڤیسین(ین).**

**ـ هوین(هوون) دنڤیسن(ن).**

**ـ ئەو دنڤیسن(ن).**

لەم نموونانەی خوارەوەدا لەگەڵ کۆمەڵە جێناوی(ئەز ـ ئەم) و (من ـ مە) جێناوە لکاوەکان بەکاردێن:

| | |
|---|---|
| **من تو دیتی** | **مە ئەوان دیتین** |
| **تە ئەز دیتم** | **وە ئەو دیتن** |
| **وی ئەم دیت** | **وان هوین دیتن** |

**٢. جێناوی نیشانە**

بەو جێناوانە دەوترێت کە لە جێی ناوی کەسێک یان شتێک دادەنرێت و دەست نیشانی دەکەن. لە کرمانجی سەرووی زمانی

کوردیدا، حەوت جێناوی نیشانەمان هەیە، کە بۆ تاک، کۆ، نێر، مێ، نزیک و دوور بەکاردەهێنرێن، جێناوەکانیش بەمشێوەیەی خوارەوەن[1]:-

**ئەڤە ← بۆ تاکی نزیک بەکاردێت.**

**ڤی ← بۆ تاکی نێری نزیک بەکاردێت.**

**ڤێ ← بۆ تاکی مێی نزیک بەکاردێت.**

**وی ← بۆ تاکی نێری دوور بەکاردێت.**

**وێ ← بۆ تاکی مێی دوور بەکاردێت.**

**(ئەڤان) ڤان ← بۆ کۆی نێر و مێی نزیک بەکاردێت.**

**(ئەوان) وان ← بۆ کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێت.**

**- ئەڤە پسمامێ منە.**

**- ئەڤە هەڤاڵی منە.**

**- ڤی چێشت خار.**

**- ڤێ ڤراڤین خار.**

**- وی چیرۆک نڤیسی.**

**- وێ چیرۆک نڤیسی.**

**- ڤان گۆڤەندەکا خۆش گرێدا.**

---

١. لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی، چاپی سێیەم، چاپخانەی ئەکاسیا، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٨٢ – ٨٣.

- **وان ڕەشبەلەک گرێدا.**

**٣. جێناوی خۆیی**

جۆرێکە لە جۆرەکانی جێناو لە ڕووی واتاوە، کە خاوەنییەتی و خۆیەتی و خاوەنداری دەگەیەنێت.

جێناوی خۆیی لە زمانی کوردیدا سێ جۆری هەیە:[١]

أ. جێناوی خۆیی جەختکردن: ئەمجۆرەیان زیاتر بە واتای جەختکردن دێت و بۆ جەختکردنی بکەر بەکاردێت، وەک:

- **ئەز ب خۆ هاتم.**

ب - جێناوی خێی ڕەنگدانەوە: ئەم جۆرەیان کارەکە یان حاڵەتەکە ڕەنگدانەوەی بەسەر بکەر و بەرکاردا دەبێ، یان بکەر و بەرکار بەهۆی جێناوە خۆییەکەوە لە یەک کەسدا کۆدەبێتەوە، وەک:

- **من خۆ شویشت.**

لێرەدا (خۆ) دەبێتە بەرکاری (من).

ج - جێناوی خاوەندارێتی: ئەمجۆرەیان زیاتر چڕکردنەوەی واتای خاوەندارێتییە، واتە ئەمجۆرەیان زیاتر واتای خاوەنێتی و خاوەندارێتی دەگەیەنێت، وەک:

---

[١]- ئەمیر مستۆ محەمەد(٢٠٠٩)، جێناو لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا (لە ڕوانگەی تیۆری دەسەڵات و بەستنەوەدا)، نامەی ماستەر، بەشی کوردی کۆلیژی زمانی زانکۆی سەلاحەددن، ل ٨٥.

**- مالا خۆ خوەشە.**

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، دوو فۆرم بۆ جێناوی خۆیی بەکاردێت، کە ئەوانیش (**خۆ – خوە**)، کە بە تەنیا بەکاردەهێنرێت و جێناوی لکاوی ناخرێتە سەر، وەکو[1]:-

**- ئەز ب خۆ هاتم.**

لە کرمانجی سەروودا دەشێ لە جیاتی (ب)، ئەوە (پ) بێت، یاخود هیچ کامێکیان بێت، واتە بەمشێوەیە:

**- ئەز پ خۆ هاتم.**

**- ئەز خۆ هاتم.**

**- من خۆ شوشت.**

**- هەم ئەهلی نەزەر نەبێن کو کورمانج**

**ئیشقی نەکرن ژبۆ خوە ئارمانج**

**- ماسیڤانی تۆرا خوە ئاڤێتە بن بەحرێ.**[2]

بەشێوەیەکی گشتی جێناوی خۆیی لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا کاتێ ئەرکەکانی(بکەر، نیهاد، بەرکاری ڕاستەوخۆ) دەبینن، ئەوا نیشانەی (ب)ی لەپێش دادەنرێت، وەک:

---

١.لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەوردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی، چاپی چوارەم، چاپخانەی (مستقبل)، لوبنان، ٢٠١٠، ل٣٠.

٢. ک.ک.کوردۆییڤ، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، و: کوردستان موکریانی، هەولێر، ١٩٨٤، ل٣٣١.

- **ئەو ب <u>خۆ</u> هات.** (ئەرکی بکەری بینیوە)
- **ئەو ب <u>خۆ</u> نزانە.** (ئەرکی نیهادی بینیوە)
- **ئەو ب <u>خۆ</u> هاتە گرتنێ.** (ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆی بینیوە)

**٤. جێناوی هەیی**

جۆرێکە لە جۆرەکانی جێناو لە ڕووی واتاوە، کە واتای خاوەنداریەتی دەگەیەنێ و، خاوەنەکەشی دەشێ ناو یان جێناو بێ و لەنێو ڕستەدا ئەرکی ناوەکە یان جێناوەکەی پێ دەسپێردرێ.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، سێ فۆرم بۆ جێناوی هەیی بەکاردێن، کە بۆ نێر، مێ، تاک و کۆ بەکاردێن، بەم شێوەیەی خوارەوەن[1]:-

١- **(یێ) ئێ** ـــ بۆ تاکی نێر بەکاردێ.

**گوندێ مە خوەشە و <u>یێ</u> وە خوەش نینە.**

لێرەدا وشەی(گوند) ناوێکی نێرە، بۆیە (یێ) بەکارهاتووە و (یێ) شوێنی (گوند)ی گرتۆتەوە.

٢- **(یا) ئا ـــ بۆ تاکی مێ بەکاردێ.**

---

١ـ أـ ڕەشید کورد، ڕێزمانا زمانێ کورمانجی، و: ئیسماعیل تاها شاهین، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٨، ل٧٨. ب - لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی، ل ٣٦ – ٣٧.

**ـ مالا مە خوەشە و یا وە خوەش نینە.**

لێرەدا وشەی(مال) ناوێکی مێیە، بۆیە (یا) بەکارهاتووە و (یا) شوێنی (مال)ی گرتۆتەوە.

**٣ـ (یێن) ئێن ـــــ بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێن.**

**کتێبێن مە مەزنن و یێن وە بچویکن.**

لێرەدا وشەی(کتێب) ناوێکی کۆیە، بۆیە (یێن) بەکارهاتووە و (یێن) شوێنی (کتێب)ی گرتۆتەوە.

**ـ ئەڤ کتێبە (یێ) ئێ منە.**

**ـ ئەڤ کتێبە (یا) ئا منە.**

**ـ ڤان کتێبێن (یێن) ئێن منن.**

**٥ـ جێناوی پرسیار**

بەو جێناوانە دەوترێ کە پرسیار لە کەسێک یان شتێک یا کاتێک یاخود ڕووداوێک دەکەن. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا کۆمەڵێ جێناو بۆ مەبەستی پرسیاری بەکاردێت، کە ئەمانەن[1]:**(کی،**

١ـ صادق بهاءالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی – کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری، چاپا یەکێ، زانکۆی سەلاحەدین، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، ١٩٨٧، ل ٢٥٣ – ٢٥٦.

**چە، کێهە، کێهان، کیژان، چەوا، چاوا، کەنگینێ، کانێ، چەنگ، ئەرێ....).**

١. **کی - کێ:** لە جێی ناوی کەسێک دێت و پرسیار لە کەسێک دەکات.

- **کی دبێژیت ئەز نەشێم بەرەڤانی یاخو بکەم ؟**
- **کی هات؟**
- **کێ ئەڤ چیرۆکە خواندییە؟**

٢. **کام - کامە - کیهە - کیهان - کیشک - کیژ. کیژک - کیژان:** هەموویان یەک واتا دەگەیەنن و بۆ جیاکردنەوەی کەسێک یان شتێک لەناو کۆمەڵە کەسێک یان کۆمەڵە شتێک بەکاردێن. وەک:

- **کیژان دشێت ب سەر ڤێ دارێ بکەڤیت؟**
- **ژ ڤان جوتیارێن کیژان گەنمێ خوە چاندییە؟**
- **کیژ قوتابی ژ هەمیان زیرەکترە؟**
- **ژ ڤان ڕەنگان تە کیژک دڤێت؟**

٣. کەنگی: پرسیار لە کات دەکات، وەک:

- **کەنگی وانان دێ خوێنی؟**

٤. **کیڤە:** پرسیار لە شوێن و جێگە دەکات، وەک:

- **تە ل کیڤە بووی؟**
- **کیڤە دچیت؟**

٥. **چی - چ**: لە جێی ناوی شتێک دێت و لە شێوەی پرسیاردا بەکاردێت.

- **دوهێ تە چی دخواند؟**
- **ئەو چ کەسەکە ل دیوانێ رونشتی؟**
- **جوتیار زڤیێ ب چ دکێلێت؟**

٦. **چەند(چڤاس)**: پرسیار لە ژمارە و ڕێژە دەکات، وەک:

- **ڕزگار ل چەند وانان کەڤتییە؟**
- **تە چڤاس پارە هەیە؟**

٧. **چەوان/ چەوا**: پرسیار لە حاڵەت و چۆنیەتی دەکات، وەک:

- **نەسرینێ چەوان(چەوا) چیرۆکێ دنڤیسیت؟**
- **شڤانی چەوان وانێ دخوینیت؟**

**٦. جێناوی هاوبەش**

بەو جێناوانە دەوترێ، کە هاوبەشی لەنێوان دوو کەس یان دوو شت دروست دەکات. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، فۆرمەکانی جێناوی هاوبەش بریتین لە (**هەڤ، پێکڤە، دگەل ئێک، یەکدوو - ئێکدوو**) بەکاردێن، و زۆربەی جاریش ئەم جێناوانە لەگەڵ (ژ، ل) دەردەکەون. وەک:

- **زارۆک ل هەڤرا دورن.**
- **وێنەیێن وان ژ ئێکدوو جوانتربوون.**

**- پەیام ژ هەڤرا (دگەل ئێک - پێکڤە) دنڤیسین.**

**- ئەسپ و زین ب هەڤرا (پێکڤە) هاتنە دزین.**

**- ئانکۆ بچویک و مەزنا ب هەڤرا (پێکڤە) سەرهلدا.**

**٧. جێناوی نەرێنی (نەفی)**

بەو جێناوانە دەوترێت کە نەرێنی کەسێک یان شتێک ڕادەگەیەنن. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، کۆمەڵێ فۆرم بۆ جێناوی نەرێنی بەکاردێن، کە بریتین لە: (**هیچ، چ، تو، قەت**)، وەکو:-

**- ئیرۆ قەت نێچیر راستی وی نەهات [1].**

**- ڤی چ زەڤی نەفرۆتینە.**

**- ئەز نکارم تو ناڤا ل کوری خوە بکەم.**

**٨. جێناوی چەندێتی**

بەم جێناوانە دەوترێت کە ڕێژەی کەسەکان یاخود شتەکان دیاری دەکات و واتای چەندێتی و پرسیار دەبەخشێ. لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، شەش فۆرم بۆ جێناوی چەندێتی بەکاردێت، کە ئەمانەن[2]:

---

[1]- ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی دووەم (جێناو)، ل ٢٨١ – ٢٨٢.

٢. ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی دووەم (جێناو)، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ١٩٨٧، ل ٢٧٦ – ٢٧٧.

**(چەند، هنەک، هندەک، چقاس، ئەڤقاس، ئەوقاس، گەلەک.. هتد).**

وەکو:

- **هەندەک (هنەک) چوون.**
- **یەک بوو ئەلیف یەک نوقگە کر**

**چەند(گەلەک) شکلێ دی لێ زێدەکر**

**٩. جێناوی دیار**

بەو جێناوانە دەوترێت کە ژمارەی کەسەکان یان شتەکان لە ڕستە و دەقدا دیاری دەکەن. بە واتایەکی تر ئەو وشانە دەگرێتەوە، کە لە جێگەی کەسێکی دیار و ئاشکرا و زانراو بەکاردێن.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، کۆمەڵێ فۆڕم بۆ جێناوی دیار بەکاردێن، لەوانە: (**هەرتشت، تەمام، هەمی، تەڤ.. هتد** )[١]

- **تەڤ ئامادەن.**
- **هەمی چوون، تو نەهاتی.**
- **تەمام فراڤین دخۆن.**

**١٠. جێناوی نادیار**

ئەو جێناوانە دەگرێتەوە، کە لەبری ناوی کەسێک یا گیانداریێک یا هەر شتێکی تر بەکار دەهێنرێت، بەڵام ئەم ناوە بەئاشکرایی دیار

---

١. ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، جێناو، ل ٢٨٥.

نییە کە کێیە و چییە، بە واتایەکی تر بەو جێناوانە دەوترێت کە لە شوێنی کەسێک یان شتێکی نادیار دێن.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، کۆمەڵێ فۆرم بۆ جێناوی نادیار دانراون، لەوانە:(**کەس، تشت، گەسەک، تشتەک، هندەک، فلان، پێهڤان،...**)[1]. وەکو:

- **کەس (چ کەس) دڤێرێرا نەچوویە بازێری**[2].
- **هندەک وەسا هزر دکەن گەلەک دزانن.**
- **تە تشتەک نەکرییە.**
- **فلان ئەرکێ خۆ دنڤیسیت.**

**١١. جێناوی لێکدەر**

ئەو جێناوانە دەگرێتەوە کە لە جیاتی ناوی کەسێک یان شتێک بەکاردەهێنرێت، کە پێشتر گوترابێ، هەروەها دوو ڕستەش پێکەوە دەبەستێت و بەیەکەوە ڕستەیەکی ئاڵۆز(**تێکەڵ**) سازدەکەن، هەمیشە جێناوی لێکدەر وەکو کەرەسەیەکی پەیوەستدار بە پاڕستەی نێو

---

١. صادق بهاءالدين ئامێدی، ڕێزمانا کوردی – کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری، چاپا یەکێ، زانکۆی سەلاحەدین، دار الشؤون الثقافية العامة، ١٩٨٧، ل ٢٦٣ – ٢٦٤.

٢. لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی دەیەمی ئامادەیی، چاپی چوارەم، چاپخانەی مستقبل، لوبنان، ٢٠١٠، ل ٥٢.

ڕستەکە هەژمار دەکرێت، چونکە ڕستەی ئاڵۆز لە شارستە و پارستە پێک دێت.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، یەک فۆرم بۆ جێناوی لێکدەر بەکاردێت، کە شارستە و پارستە دەخاتە پاڵ یەکتری و بەهۆیەوە ڕستەیەکی ئاڵۆز دروست دەکات، ئەم فۆرمەش (کو)ە. وەکو:

- مە ئەو دیت کو دکەنی.

شیرینێ کو ماف هەیە، دڤێت دەنگێ بدەت.

مە ژ ئازادی ڤیبا، کو ئێکدی ژبیر نەکەن.

- من شڤان دیت کو ژ ترسان دلەرزی[1].

---

[1]- لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی، ل٦.

# ئـــاوەڵـنـــاو

## چەمک و پێناسەی ئاوەڵناو

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی ئاوەڵناو، زاراوەکانی (**هاوەڵناو، هەڤلناڤ، هاوەڵناڤ، سیفە.....**) بەکاردێن. ئاوەڵناویش بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە وەسفی ناوێک یاخود جێناوێک دەکات، بەهۆیەوە دەبێتە تەواوکەری ناو یان جێناو یان ئاوەڵناوێکی تر یان تەواوکەری کارێکی ناتەواو.

ئاوەڵناو لە ڕستەدا پەیوەستە بە ناو و جێناوەوە، واتە دۆست و هاوڕێی ناو و جێناوە. ئاوەڵناویش هەروەکو ناو و ئاوەڵکار هیچ نیشانەیەکی مۆرفۆلۆژی نییە، بۆ ئەوەی لە ڕووی ڕوخسارەوە دیاری بکرێت، بەڵکو دیاریکردنی ئاوەڵناو لە ڕستەدا پەیوەستە بە واتاوە.

## جۆرەکانی ئاوەڵناو

### یەکەم: جۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕووی واتاوە

#### ١. ئاوەڵناوی چۆنیەتی

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت کە چۆنیەتی خاسیەت و نیشانە دەگەیەنن، لەگەڵ ئەوەشدا ئاوەڵناوی چۆنیەتی هەمەجۆرە، لەوانە واتای ڕەنگ نیشان دەدات (زەر، **شین سۆر، سپی, کەسک...**)، چەمکی ئاڕاستە و دەوروبەر ڕادەگەیەنێ (**ڕاست، چەپ...**)، یاخود سیفەت نیشان دەدات (**ڕەزیل، ڕووخۆش، زیرەک...**)، یاخود شێوە و قەبارە دەردەبڕێ (**قەڵەو، پان، بەرین، لاواز....**)، یاخود تامکردن دەگەیەنێت (**تیژ، سویر، شرین، ترش، مز.....**)، یاخود پلەی گەرمی و کەشوهەوا بەکاردێت (سار، گەرم، **تەزی**، ......)....

- **تریێ ڕەش بکرە.**
- **هنارە ترش خوەشە.**
- **گۆتنا خۆش بهارا دلانە.**
- **شرین کەچەکا نازدارە.**
- **کوڕێ مەزن هات.**

**٢. ئاوەڵناوی نیشانە**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت کە دەستنیشانی ناوی کەسێک یان شتێک یان زیاتر لە ڕستەدا دەکەن. ئاوەڵناوەکانی نیشانە هەمیشە دەبنە دوو پارچە، پارچەیەکیان دەکەوێتە پێش ناوەکە و پارچەکەی تریان دەکەوێتە دوای ناوەکە، ئەم دوو پارچەیە دەبنە دیارخەر بۆ ناوەکە، هەر بۆیەشە هەر ناوێک بە ئاوەڵناوی نیشانە دەستنیشان بکرێت، ئەوا دەبێتە ناوێکی ناسراو.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، فۆرمەکانی ئاوەڵناوی نیشانە بەمشێوەیەی خوارەوەن:

(ئەڤ.... ە) لەگەڵ ناوێکی تاکی نێر و مێی نزیک بەکاردێ.

**- ئەڤ کتێبە یێ مەیە.**

(ڤی.... ی) لەگەڵ ناوێکی تاکی نێری نزیک بەکاردێ.

**- ڤی خورتی سەرێ مە بلندکر.**

**(ڤێ......ێ) لەگەڵ ناوێکی تاکی مێی نزیک بەکاردێ.**

**- ڤێ قوتابیێ وانە باش خواند.**

(وی.....ی) لەگەڵ ناوێکی تاکی نێری دوور بەکاردێ.

**- وی ڕەزڤانی ڕەزێ خۆ فرۆت.**

(وێ.... ێ) لەگەڵ ناوێکی تاکی مێی دوور بەکاردێ.

**- وێ گۆتنێ دلێ مە خۆشکر.**

**(ڤان - ئەڤان.... ان)** لەگەڵ ناوێکی تاکی نێر و مێی نزیک بەکاردێ.

**- ڤان گولان بچینە.**

**(وان - ئەوان....ان)** لەگەڵ ناوێکی کۆی نێر و مێی دوور بەکاردێ.

**- وان جوتیاران زەڤیێن خۆ کێلان.**

دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە بەراورد لە نێوان جێناوی نیشانە و ئاوەڵناوی نیشانە بکەین :

| جێناوی نیشانە | ئاوەڵناوی نیشانە |
|---|---|
| ١- جۆرێکە لە جۆرەکانی جێناو لە ڕووی واتاوە. | ١- جۆرێکە لە جۆرەکانی ئاوەڵناو لە ڕووی واتاوە. |
| ٢- هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینێ (بکەر، بەرکاری ڕاستەوخۆ، بەرکاری ناڕاستەوخۆ، نیهاد، گوزارە....). | ٢- تەنیا ئەرکی دیارخەری ناو دەبینێ. |
| ٣- هەمیشە لە جێی ناو دێ. | ٣- هەمیشە لەگەڵ ناو دێ، بە هۆیەوە ناوەکەش دەبێتە ناوێکی ناسراو. |
| ٤- لەناو ڕستەدا لە شێوەی یەک پارچە دێ. | ٤- لە ناو ڕستەدا ئاوەڵناوی نیشانە دەبێتە دوو پارچە، پارچەیەکیان دەکەوێتە پێش ناو و پارچەکەی تریان دەکەوێتە دوای ناوەکە. |

## دووەم: ئاوەڵناو لە ڕووی پلەوە

**أ. ئاوەڵناوی پلەی چەسپاو:**

ئەو ئاوەڵناوانە دەگرێتەوە کە بەراورد لە نێوان هیچ کەس و شتێک ناکەن، بەڵکو تەنیا پلەی نەگۆڕ و چەسپاوی ناوەکە یاخود جێناوەکە دەخاتە ڕوو، واتە تەنیا وەسفی ناوەکە یاخود جێناوەکە دەکات و، دەبێتە تەواوکەری ناو یان جێناو یان کاری ناتەواو، وەکو **(باش، خراپ، تژی، جوان، پاقژ، زیرەک، ئازا، خێرا،....).**

**- جلکێن جوان بکڕە.**

**- ئاڤا پاقژ ڤەخۆ.**

**- مەتینی نانێ گەرم ئینا.**

**ب. ئاوەڵناوی پلەی بەراورد:**

ئەو ئاوەڵناوانە دەگرێتەوە کە بەراورد لە نێوان دوو کەس یان دوو شت دەکەن، بە جۆرێک یەکێکیان بە باشتر و چاکتر دادەنێ لە ئەویتریان، ئەم جۆرەیان بە زیادکردنی نیشانەی (- تر) کە دەخرێتە سەر ئاوەڵناوی پلەی چەسپاو و هاریکاری ئامرازی (ژ ، ل) دروست دەبێت، یاساکەی بەم شێوەیە:

**هاوەڵناوی پلەی چەسپاو + تر = ئاوەڵناوی پلەی بەراورد**

**باش + نیشانەی(تر) = باشتر**

**پاقژ + نیشانەی(تر) = پاقژتر**

**زیرەک + نیشانەی(تر) = زیرەکتر**

**- نەسرین ژ نەرمینێ زیرەکترە.**

**- کاوە ژ ئەلندی قەلەوترە.**

**- تو ل ئاوازێ نەساختری.**[1]

**ج. ئاوەڵناوی پلەی باڵا:**

ئەو ئاوەڵناونە دەگریتەوە، کە بەراورد لە نێوان کەسێک لەگەڵ کۆمەڵە کەسێک یان شتێک لەگەڵ کۆمەڵە شتێک دەکەن.

پێشتر لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا نیشانەیەکی تایبەتی نەبوو بۆ جیاکردنەوەی پلەی باڵا لە پلەکانی تر، واتە نیشانەی (-ترین) پێشتر لە کرمانجی سەروو لە بواری نووسین بەکارنەدەهات یاخود زۆر بە کەمی دەبینرا، بەڵام ئەمڕۆکە ئەم نیشانەیە بەکاردەهێنرێت و دەبینرێت.

دەستوورەکانی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

**١.ئاوەڵناوی پلەی چەسپاو + نیشانەی(ترین)= ئاوەڵناوی پلەی باڵا**

**باش + ترین = باشترین**

---

[1]- ڤیان ئیبراهیم عەلی(٢٠٠٨)، تایبەتیێن هەڤالناڤی د زمانێ کوردیدا(دیالێکتا سەری - گوڤەرا بەهدینی)، نامەی ماستەر، بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی دهۆک، ل ٩٨.

چاک + ترین = چاکترین

٢. ئاوەڵناوی پلەی بەراورد + نیشانەی(ین) = ئاوەڵناوی پلەی باڵا

باشتر + ین = باشترین

چاکتر + ین = چاکترین

- دلۆڤان زیرەکترین قوتابییە دڤێ پۆلیدا.

٣. (ل - ژ) هەمی/ هەمیان/ حەمی/ خڕ + ئاوەڵناوی پلەی بەراورد = ئاوەڵناوی پلەی باڵا

- نەرمین ژ هەمی قوتابیان هێمنترە.

- ئەڤە ژ هەمیا نەرمترە.

ئەڤ گولە ژ حەمیا تازەتر بی.[1]

٤. هەرە + ئاوەڵناوی پلەی چەسپاو = ئاوەڵناوی پلەی باڵا

دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە ئاوەڵناوی چۆنیەتی نیشانەکانی (تر، ترین) وەردەگرێت، بەڵام جۆرەکانی تری ئاوەڵناو ئەم نیشانانە وەرناگرن.

## ئاوەڵناو لە ڕووی پێکهاتنەوە

[1]- ڤیان ئیبراهیم عەلی(٢٠٠٨)، تایبەتیێن هەڤالناڤی د زمانێ کوردیدا(دیالێکتا سەری - گوڤەرا بەهدینی)، نامەی ماستەر، بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی دهۆک، ل ١٠٢.

**ئاوەڵناو لە ڕووی پێکهاتنەوە:**

ئاوەڵناو لە ڕووی پێکهاتنەوە پێکدێت لە:

**أ- ئاوەڵناوی سادە:-**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت، کە لە یەک وشەی واتاداری سەربەخۆ پێکدێن، وەکو: (جوان، پاقژ، زیرەک، سویر، لێژ، خراپ، باش، بەرز، قورس،...هتد).

**ب - ئاوەڵناوی داڕژاو:-**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت کە لە وشەیەکی سادە و پێشگرێک، یاخود پاشگرێک یاخود هەردووکیان پێکدێت.

یاساکانی سازکردنی ئاوەڵناوی داڕژاویش بەم شێوەیەی خوارەوەن:-

**١- پێشگر(بێ، ب، نە) + ناو = ئاوەڵناوی داڕژاو**

بێ + چارە = بێچارە

بێ + مراد = بێمراد

بێ + هێز = بێهێز

ب + تام = بتام

ب + جەرگ = بجەرگ

ب + زەوق = بزەوق

نە + فام = نەفام

نە + حەز = نەحەز

**٢ ـ ناو + پاشگر (ی، ین، ن، ۆڵ، ەوەر، دار، بار، انە، انی، وکی، وکە، کی، ەوی، ەلو، و،.........هتد) = ئاوەڵناوی دارڕژاو**

هاڤین + ی = هاڤینی

زێڕ + ین = زێڕین

شەرم + ین = شەرمین

شەرم + ن = شەرمن

کرم + ۆڵ = کرمۆڵ

جەنگ + ەوەر = جەنگەوەر

ئەڤین + دار = ئەڤیندار

داخ + بار = داخبار

گونەهـ + بار = گونەهبار

مێر + انە = مێرانە

کوڕ + انی = کوڕانی

خێڵ + ەکی = خێڵەکی

ترس + ناک = ترسناک

هاوین + ە = هاوینە

فێل + باز = فێلباز

هۆش + مەند = هۆشمەند

غەم + گین = غەمگین

درۆ + زن = درۆزن

خەو + وکی = خەووکی

شەڕ + وکە = شەڕوکە

تۆز + کی = تۆزکی

تۆز + ەوی = تۆزەوی

زەوق + و= زەوقو

**٣ . پێشگری (نە) + ئاوەڵناوی سادە = ئاوەڵناوی دارِژاو**

نە + خوش = نەخوش

نە + ساخ = نەساخ

**٤. ئاوەڵناوی سادە + پاشگر (وکی, وکە, وک, ە، انی، ا، ەلە، یل، کەلە، کیلە، لکە، ا) = ئاوەڵناوی دارِژاو**

نەرم + وکی = نەرموکی

ڕەش + وکی = ڕەشوکی

تەخت + انی = تەختانی

ڕەق + انی = ڕەقانی

ڕەش + وکە = ڕەشوکە

گێژ + وکە = گێژوکە

جحێل + وکە = جحێلوک

بچویک + وکە = بچویوک

نەرم + ە = نەرمە

سۆر + ە = سۆرە

باریک + ەلە = باریکەلە

ورد + یل = وردیل

جوان + کەلە = جوانکەلە

جوان + کیلە = جوانکیلە

بەرز + ۆڵکە = بەرزۆڵکە

سپی + لکە = سپیلکە

ڕوون + اک = ڕووناک

**٥. پێشگر + ڕەگی کار = ئاوەڵناوی دارِژاو**

نە + مر = نەمر

بـ + وێر = بوێر

بـ + کوژ = بکوژ

**٦. ڕەگی کار + پاشگر(وک, ەک, ا, ار) = ئاوەڵناوی دارِژاو**

لەرز + وک = لەرزوک

گەڕ + وک = گەڕوک

نوویس + ەک = نوویسەک

کوژ + ەک = کوژەک

زان + ا = زانا

خەو + ار = خەوار

**٧. ئاوەڵکاری سادە + پاشگر = ئاوەڵناوی دارِژاو**

سەر + ەکی = سەرەکی

**ج ـ ئاوەڵناوی لێکدراو:**

بەو ئاوەڵناوانە دەوترێت، کە لە دوو وشە یان زیاتر پێکدێت. یاساکانی سازکردنی ئاوەڵناوی لێکدراویش بەم شێوەیەی خوارەوەن:

**١. ناو + ناو = ئاوەڵناوی لێکدراو**

گەردن + بلوور = گەردن بلوور

بەژن + چنار = بەژن چنار

**٢- ناو + ئاوەڵناوی سادە = ئاوەڵناوی لێکدراو**

ڕوو + خوش = ڕووخوش

خەم + سار = خەمسار

شەڤ+ کوێر = شەڤکوێر

تام + سار = تامسار

**٣- ناو + ناوی بەرکار = ئاوەڵناوی لێکدراو**

سەر + شکاو = سەرشکاو

دڵ + سووتاو = دڵسووتاو

**٤- ناو + ب + ناو = ئاوەڵناوی لێکدراو**

خوەلی + ب + سەر = خوەلیبسەر

دەر + ب + دەر = دەربدەر

**٥- ناوی سادە + ە + ناوی سادە = ناوی لێکدراو**

تەپ + ە + سەر = تەپەسەر

دەرد + ە + سەر = دەردەسەر

**٦- ناو + ڕەگی کار = ئاوەڵناوی لێکدراو**

خوێن + مێژ = خوێنمێژ

دڵ + تەزین = دلتەزین

مێر + کوژ = مێرکوژ

**٧- دووبارەکردنەوەی ناو + پاشگری (ی)= ئاوەڵناوی لێکدراو**

سەرسەر + ی = سەرسەری

دەم دەم + ی = دەمدەمی

**٨ـ دووبارەکردنەوەی ناو + پاشگری (وک)= ئاوەڵناوی لێکدراو**

خاڵ خاڵ + وک = خاڵخاڵوک

خش خش + وک = خشخشوک

**٩ـ ب + ناوی سادە + و + ناوی سادە = ئاوەڵناوی لێکدراو**

ب + ناڤ + و + دەنگ = بناڤودەنگ

ب + خێر + و + بێر = بخێروبێر

**١٠ـ بێ + ناوی سادە + و + ناوی سادە = ئاوەڵناوی لێکدراو**

بێ + سەر + و + شوێن = بێسەروشوێن

بێ + دەست + و + لەپ = بێدەستولەپ

**١١ـ ئاوەڵناوی سادە + ناو = ئاوەڵناوی لێکدراو**

تەنگ + ئاڤ = تەنگاڤ

دوير + بەڵا = دويربەڵا

**١٢ـ ئاوەڵناوی سادە + ئاوەڵناوی سادە= ئاوەڵناوی لێکدراو**

ڕەش + بەلەک = ڕەشبەلەک

ڕەش+ ئەسمەر = ڕەشئەسمەر

**١٣ـ ئاوەڵناوی سادە + و + ئاوەڵناوی سادە= ئاوەڵناوی لێکدراو**

سست + و + خاڤ = سستوخاڤ

گەرم + و+ نەرم = گەرمونەرم

پاقژ + و + بژوین = پاقژوبژوين

تێر + و + تژی = تێروتژی

**١٤ـ ئاوەڵناوی سادە + ڕەگی کار = ئاوەڵناوی لێکدراو**

ڕاست + بێژ = ڕاسبێژ

دویر + بین = دویربین

**١٥ــ دووبارەکردنــەوەی ئاوەڵنــاو + پاشــگری (وک)= ئاوەڵنــاوی لێکدراو**

ڕەق ڕەق + وک = ڕەقرەقوک

قوت قوت +وک = قوتقوتوک

**١٦- وشەیەکی بێواتا + و+ئاوەڵناو = ئاوەڵناوی لێکدراو**

شەپ + و + شۆڕ = شەپوشۆڕ

ڤرت + و + ڤالا = ڤرتوڤالا

**١٧- ژمارە + ناو = ئاوەڵناوی لێکدراو**

دوو + دڵ = دوودڵ

دوو + بەر = دووبەر

دوو + ڕووی = دووڕووی

**١٨- ئاوەڵکاری سادە + ب + ڕەگی کار = ئاوەڵناوی لێکدراو**

زۆر + بڵێ = زۆربڵێ

**١٩- ئاوەڵکـاری سـادە + ڕەگـی کـار + پاشـگری (ەر) = ئاوەڵنـاوی لێکدراو**

کێم + خۆ + ەر = کێمخۆر

زۆر + خۆ + ەر = زۆرخۆر

# کـــار

### چەمک و پێناسەی کار

کار بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە ڕوودان و کاتی تێدایە، مەبەست لە ڕوودانەکە، ئەوەیە کە شتێک ڕوویدابێ یان ئەنجام درابێ، مەبەستیش لە کات، کاتی ڕانەبوردوو و ڕابوردوو دەگرێتەوە[1].

## جۆرەکانی کار

### یەکەم: جۆرەکانی کار لە ڕووی کاتەوە

**١. کاری ڕابوردوو**

ئەو کارەیە، کە ڕوودانەکەی دەکەوێتە پێش ئاخاوتنەوە، واتا ڕوودانی کارەکە بەسەر چووە و ڕوویداوە **((کرداری ڕابوردوو ئەو**

١. بۆ شارەزا بوون لەم بابەتە، بگەڕێوە بۆ: ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی پێنجەم (کردار)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.

**کردارەیە، کە پرۆتسێسی ڕوودانەکەی پێش ئاخاوتن بکەوێ))**[١]. لە زمانی کوردیدا بۆ سازکردنی کاری ڕابوردوو، پەنادەبرێتە بەر چاوگ، ئەمیش بە لابردنی (ن)ی چاوگ ساز دەبێت **((لە زمانی کوردیدا فرمانی ڕابوردوو بە لابردنی (ن)ی چاوگ دروست دەکرێت))**[٢]، لەم حاڵەتەشدا کاری ڕابوردووی نزیک دروست دەبێت، کە بە یەکێک لەم پێنج مۆرفیمە (وو، ی، د، ا، ت) کۆتاییان دێت:

مۆرفیمی (وو):

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفیمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| چوون | - ن | چوو | وو |
| بوون | - ن | بوو | وو |
| دروون | - ن | دروو | وو |
| جوون | - ن | جوو | وو |

مۆرفیمی (ی):

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفیمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|

١- ئەورەحمانی حاجی مارف (د)، کردار، ل٢٠٠.

2- عبدالله شالی، ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگ و بۆ فرمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی (دار الجاحظ)، ١٩٧٦، بەغدا، ل٤.

| | | | |
|---|---|---|---|
| کڕین | - ن | کڕی | ی |
| فڕین | - ن | فڕی | ی |
| بڕین | - ن | بڕی | ی |
| سڕین | - ن | سڕی | ی |

مۆرفیمی (د):-

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفیمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| مردن | - ن | مرد | د |
| کردن | - ن | کرد | د |
| بردن | - ن | برد | د |
| خواردن | - ن | خوارد | د |

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا لە زۆرینەی حاڵەتەکاندا فۆنیمی (د) لە نووسیندا تێدەچێت. وەک:

مرن - ن = مر

کرن - ن = کر

برن - ن = بر

خارن - ن = خار

بۆیە ڕوودانی ئەم حاڵەتە وایکردووە، کە زۆرێک لە زمانناسان بڵێن لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا مۆرفیمی (د) بۆ کاتی ڕابوردوو دەرناکەوێت، یان هەندێکی تر گومان بۆ ئەوە دەبەن کە مۆرفێمەکە (ر) بێت، نەک (د).

مۆرفیمی (ا):-

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفیمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| سووتان | - ن | سووتا | ا |
| ڕووخان | - ن | ڕووخا | ا |
| شکان | - ن | شکا | ا |
| ڕژان | - ن | ڕژا | ا |

مۆرفیمی (ت):

| چاوگ | لابردنی (ن) | کاری ڕابوردوو | مۆرفیمی ڕابوردوو |
|---|---|---|---|
| کەفتن | - ن | کەفت | ت |
| خەفتن | - ن | خەفت | ت |
| شویشتن | - ن | شویشت | ت |
| نقستن | - ن | نقست | ت |

## جۆرەکانی کاری ڕابوردوو

**١. ڕابوردووی نزیک:**

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودانی کارێک لە ڕابوردووی نزیکدا دەکات[1]، ئەمجۆرەیان بە لابردنی (ن)ی چاوگ دروست دەبێت، واتە لێکردنەوەی (ن)ی چاوگ، هەم کاری ڕابوردوو دروست دەبێت، هەم ڕابوردووی نزیک و هەم قەدی چاوگ.

چاوگ – ن = ڕابوردووی نزیک

چوون – ن = چوو

برن – ن = بر

سۆتان – ن = سۆتا

کەفتن – ن = کەفت

مرن – ن = مر

**- وێ بازنێ زێڕی کڕی.**

**- دەمێ ئەز چووم، بابێ من نڤستبوو.**

**- نازدارێ وانە خواند.**

**به واتایەکی تر:**

---

١. نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠، ل٢٠٢.

**چاوگ ـ ن= ڕابوردوو(ڕابوردووی نزیک، قەدی چاوگ)**

**کاری ڕابوردوو = کاری ڕابوردووی نزیک = قەدی چاوگ**

یەکێ لە سوودەکانی کاری ڕابوردووی نزیک، ئەوەیە کە هەموو جۆرەکانی تری کاری ڕابوردوو لە ئەوەوە سازدەکرێت.

**٢. ڕابوردووی بەردەوام:**

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودان و بەردەوامی کارێک لە کاتی ڕابوردوودا دەکات[١].

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، تەنیا نیشانەی (د) وەکو نیشانەی ڕابوردووی بەردەوام بەکاردێت و دەکەوێتە بەشی پێشەوەی کارەکە، واتە یاساکەی بەمشێوەیە:

**نیشانەی (د) + ڕابوردووی نزیک= ڕابوردووی بەردەوام**

**د + کەفت = دکەفت**

**د + نڤیسی = دنڤیسی**

**د + چوو = دچوو**

**ـ ئەز دهاتم.**

**ـ من کەوەک دگرت.**[١]

---

١ـ نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠، ل ٢٢٣.

لە کاری دارڕژاو و لێکدراودا، نیشانەی (د) دەچێتە دوا بەشی یەکەمی کارەکە، وەک:

**د + ڕاگرت = رادگرت**

**د + سەرکەفت = سەردکەفت**

**٣. ڕابوردووی دوور:**

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودانی کارێک لە ڕابوردووی دووردا دەکات[٢].

**ڕابوردووی نزیک + نیشانەی (بوو) = ڕابوردووی دوور**

**کەڤت + بوو = کەفتبوو**

**خەفت + بوو = خەفتبوو**

**سۆتا + بوو = سۆتابوو**

**شکا + بوو = شکابوو**

**- دەمێ ئەز چووم، بابێ من نڤستبوو.**

**٤. ڕابوردووی تەواو:**

---

١. بائیز عمر احمد، تێنس لە دایالێکتی ژووری زمانی کوردیدا (گوڤەری بادینی)، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی خەبات، دهۆک، ٢٠٠٢، ل ١٦.

٢. نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٦٠، ل ١١٦.

ئەو کارەیە، کە دەلالەت لەسەر ڕوودانی کارێک لە ڕابوردوویەکی نە زۆر دوور و نە زۆر نزیکدا دەکات[1].

**ڕابوردووی نزیک + نیشانەی(وە / یە) = ڕابوردووی تەواو (ووە / ییە)**

**کەفت + ییە = کەفتییە**

سۆتا + یە = سۆتایە

**- سیروانی نامە نڤیسییە.**

ئەگەر کاری ڕابوردووی نزیک کۆتایی بە فۆنێمەکانی (ت، د) هاتبێ، ئەوا بۆ کاری ڕابوردووی تەواو، مۆرفیمەکانی (ییە) وەردەگرێت، بەڵام ئەگەر کاری ڕابوردووی نزیک کۆتایی بە مۆرفیمەکانی (ا، وو، ی) هاتبێ، ئەوە مۆرفیمی (یە) وەردەگرن.

**- من گرتییە.**

**- وی چێشت خوارییە.**

**- ئەز کتێب کڕییە.**

بۆ نەرێکردنی کاری ڕابوردوو، ئەوە نیشانەی (نە) وەردەگرێ، بە جۆرێک ئەگەر کارەکە سادە بوو، ئەوە نیشانەکە لە پێشەوەی کارەکە دادەنرێت.

---

١. نووری عەلی ئەمین، قەواعیدی زمانی کوردی لە (صرف و نەحو)دا، بەرگی یەکەم، ١٩٥٦، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ل ١٧.

| نەرێ | ئەرێ |
|---|---|
| نەگرت | گرت |
| نەگرتبوو | گرتبوو |
| نەگرتییە | گرتییە |
| نەدگرت | دگرت |

بەڵام ئەگەر کارەکە (دارژاو، لێکدراو) بوو، ئەوا نیشانەی (نە) دەکەوێتە دوای بەشی یەکەمی کارەکە.

| نەرێ | ئەرێ |
|---|---|
| رانەگرت | راگرت |
| سەرنەگرت | سەرگرت |

**٢. کاری ڕانەبوردوو**

ئەو کارەیە، کە ڕوودانەکەی دەکەوێتە دوای ئاخاوتن، واتا کارەکە ڕووی نەداوە، یان ئێستا ڕوودەدات یان لە داهاتوودا. لە زمانی کوردیدا بۆ سازکردنی کاری ڕانەبوردوو، پەنا دەبرێتە بەر (ڕەگی کار) و مۆرفێمی ئەرێی ڕانەبوردووش دەکەوێتە پێش ڕەگەکە و جێناوی لکاویش بە کارەکەوە دەنووسێت.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، نیشانەی تایبەت و مۆرفۆلۆژیمان هەیە بۆ جیاکردنەوەی ڕانەبوردووی ئێستا لە ڕانەبوردووی داهاتوو، دەستورەکانیشیان بەمشێوەیەی خوارەوەیە:

**ڕانەبوردووی ئێستا: نیشانەی(د) + ڕەگی کار + جێناوی لکاو**

خارن ← د + خۆ + م =دخۆم

شویشتن ← د + شۆ + م = دشۆم

نڤیسین ← د + نڤیس + م = دنڤیسم

**ڕانەبوردووی داهاتوو: نیشانەی (دێ) + ڕەگی کار + جێناوی لکاو**

خارن ← دێ + خۆ + م =دێ خۆم

شویشتن ← دێ + شۆ + م = دێ شۆم

نڤیسین ← دێ + نڤیس + م = دێ نڤیسم

بۆ نەرێکردنی کاری ڕانەبوردووش، ئەوە نیشانەی (نا) دەچێتە شوێنی (د) و (دێ) و دەیکات بە نەرێ، وەک:

| ئەرێ | نەرێ |
|---|---|
| دچم | ناچم |
| دێ چم | ناچم |

- نووکە دچم.
- نووکە ناچم.
- پشتی نیڤەڕۆ دێ چم.
- پشتی نیڤەڕۆ ناچم.

## دووەم: کار لە ڕووی پێکهاتنەوە

سەبارەت بە پۆلێنکردنی کار لە ڕووی پێکهاتنەوە، ئەوە زمانەوانان و نووسەران بیروبۆچوونی جیا جیایان خستۆتە ڕوو، هەندێکیان لەو باوەڕەدان کە (کاری سادە) نەک لە زمانی کوردی، بەڵکو لە هیچ زمانێکی جیهاندا نییە، لەم بارەوە (د.محەمەد مەعروف فەتاح) دەڵێت:((کاری سادە لە زمانی کوردیدا نییە)).[1] هەروەها (د.وریا عومەر ئەمین)یش هەمان بۆچوون و ڕای هەیە کە دەڵێت:((بەپێی پێوەرە تازەکانی زمانەوانی و مەنتیقی پەیوەندی نێوان کەرەسەکانی زمان، کاری سادە نەک هەر لە کوردیدا نییە، بەڵکو لە هیچ زمانێکا نابێ هەبێ))[2]. دیارە هەردوو زمانەوان لەسەر بنەمای مۆرفیم سەیری کاریان کردووە، هەر بۆیەشە ئەم بیروبۆچوونەیان هەیە. لەهەمان کاتیشدا (د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف) ئەمە بە ڕاست نازانێت کە کاری سادە لە زمانی کوردیدا نەبێت، هەر بۆیە لە وتارێکی ڕەخنەییدا بەپێی بۆچوونەکانی خۆی و

---

١ـ محەمەد مەعروف فەتاح(د)، کار و پۆلێن کردنەکانی بەپێی ڕۆنان، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١)، ١٩٨٩، ل ٤٠ ـ ٥٩.

٢ـ وریا عومەر ئەمین(د)، ڕەخنەی نارەخنە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٤٠)، ١٩٩٧، ل ٢٢ ـ ٢٤.

بەنموونەیی پراکتیکی ڕاستی بوونی کاری سادە لە زمانی کوردیدا دەردەخات[١].

بۆیە ئێمە وەکو لە دەستپێکی کتێبەکەدا ئاماژەمان بۆ کرد، کە لەسەر بنەمای وشەوە سەیری کار دەکەین، هەر بۆیە کار لە ڕووی پێکهاتنەوە بە لای ئێمەوە بەسەر (کاری سادە، کاری داڕژاو، کاری لێکدراو) دابەش دەکرێت.

**١. کاری سادە**

بەو کارانە دەوترێت کە لە یەک وشەی واتاداری سەربەخۆ پێکدێن، وەکو : چوو، ڕۆیشت، شکا ........هتد.

**٢. کاری داڕژاو**

کارێکی ناسادەیە لە کارێکی سادەی واتادار و پاشگرێک یان پێشگرێک یاخود لەگەڵ هەردووکیان پێک دێت.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، کۆمەڵێ پێشگر و پاشگر هەن، کە بەشداری لە سازکردنی کاری داڕژاو دەکەن، لەوانە[٢]:

---

1- ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، وتاری کار پۆلێن بەپێی ڕۆنان و چەند سەرنجێک، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٩)، ١٩٩٧، ل ٨ ـ ١٦.

٢. سەلوا فەریق سالح، کاری داڕێژراو لەنێوان کوردی (دیالێکتی ژووروو) و فارسیدا، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی خانی، دهۆک، ٢٠٠٩، ل ٣٤ ـ ٣٩.

١.(ڤە)، وەک پێشگر و پاشگر بەکاردێت و واتای دووپاتکردنەوە دەگەیەنێت، بەمشێوەیە: (ڤەخار، ڤەکوشت، ڤەکر، ڤەشار، ڤەڕەڤی، ڤەهێلا، ڕابووڤە، ڤەخارڤە.. هتد).

٢. (. ەڤە) ئەم پاشگرە بەرانبەر پاشگری (. ەوە) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:(هاتمەڤە، دچینەڤە, کەفتەڤە، شکەستەڤە ،.... هتد).

٣. اندن: ئەم پاشگرە ڕۆڵی تێپەڕاندن دەبینێ، وەک:

کەڤتن ← کەڤتاندن

ڕزین ← ڕزاندن

٤. (ڤێ .)، وەک: (ڤێکەفت، ڤێخست، ڤێگرت...... هتد).

٥.(هل .)، وەک:(هلدا، هلبوو، هلکر، هلکشا، هلوەشیا، هلوەشاند، هلکولی.......هتد).

٦. (هن .)، وەک:(هنگرتن، هنجنی، هنگافتن،........هتد)(١).

٧. (دا .)، وەک:(داچوو، داگرت، دادا، داکەڤت، داشکاند، داڕشت،......هتد).

٨.(ڕا.)، وەک:(ڕاکر، ڕادا، ڕائێخست، ڕاهێنا، ڕاگرت، ڕاکەت، ڕاهێشت، ڕاپێچا، ڕاگەهاند،....هتد).

---

١. فاضل عومەر، ئاورەک د زمانێ کوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٢٠٨.

٩ـ (وەر ـ)، وەک:(وەرگەڕان، وەرسوڕان، وەرگرتن،.......هتد).

١٠ـ (ڕوو ـ)، وەک:(ڕوودان، ڕووکرێ، ڕووکر،.......هتد).

١١ـ (پێ ـ)، وەک:(پێکەنین، پێگەیشتن، پێکەڤتن......هتد)[1].

١٢ـ(تێ ـ)، وەک:(تێفکرین،[2]تێگەهشتن، تێگرتن، تێکرن،....هتد)[3].

١٣ـ (ژێ ـ)، وەک:(ژێخارن، ژێدزین، ژێکرن،......هتد).

١٤ـ (چێ ـ)، وەک: (چێکر، چێبوو....هتد).[4]

**٢ـ کاری لێکدراو:**

ئەو کارەیە کە لە دوو وشەی سادە یان زیاتر پێکدێت و لەناو ڕستەشدا وەکو وشەیەکی سەربەخۆ ئەرکی خۆیان دەبینن، ئەم وشە لێکدراوانەش لە کارێک لەگەڵ بەشێکی تری ئاخاوتن پێکدێن، وەکو:

**١ـ ناوی سادە + کاری سادە = کاری لێکدراو**

ئاڤ + دا =ئاڤدا

دەست + کەفت = دەستکەفت

شەڕ + کر = شەڕکر

---

١ـ عەبدوللا حوسێن ڕەسووڵ، مۆرفیمە ڕێزمانیەکانی کار، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٥، ل ٣٧.

٢ـ هەمان سەرچاوە، ل ٤٠.

٣ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، ل ٧٣.

٤ـ دلبرین عەبدوللا عەلی(٢٠١٢)، جوداکرنا کارێ لێکدای ژ کارێ خودان تەواوکەر و بەرکار، چاپخانەی هەوار، دهۆک، ل٤١.

یارمەتی + دا = یارمەتیدا

سوار + بوو= سواربوو

**٢. ناوی دارِژاو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

ژبیر + کر = ژبیرکر

ڕێگا + گرت = ڕێگاگرت

گەرما + بوو = گەرمابوو

بکار + ئێنا = بکارئێنا

**٣. ناوی لێکدراو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

چلکاڤ + خارن = چلکاڤخارن

ماستاڤ + خارن = ماستاڤخارن

ماڵئاوایی + کر = ماڵئاواییکر

**٤. ناوی سادە + کاری دارِژاو = کاری لێکدراو**

دەست + هەڵبڕی = دەست هەڵبڕی

دەست + ڤەدا = دەسڤەدا

چاڤ + پێکەڤت = چاڤپێکەڤت

**٥- دووبارەکردنەوەی ناو+ کاری سادە= کاری لێکدراو**

تیلم تیلم + کر= تیلم تیلم کر

پارچە پارچە + بوو= پارچە پارچە بوو

**٦- ناوی دارِژاو + کاری دارِژاو = کاری لێکدراو**

جێگە + کرەوە = جێگەکردەوە

ڕێگە + کرەوە= ڕێگەکردەوە

**٧ـ فرێزی ناوی + کاری سادە = کاری لێکدراو**

لهۆش + چوو = لهۆش چوو

ژبیر + کر = ژبیرکر

**٨ـ فرێزی ناوی + کاری داڕژاو = کاری لێکدراو**

ژبیر + هاتەوە = ژبیرهاتەوە

ژبیر + کرتەڤە = ژبیرکرتەڤە

**٩ـ ئاوەڵناوی سادە + کاری سادە = کاری لێکدراو**

مەزن + کر = مەزنکر

سپی + کر = سپیکر

بڵند + کر = بڵندکر

خۆش + کر = خۆشکر

**١٠- دووبارەکردنەوەی ئاوەڵناو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

هور هور + کر = هورهورکر

هور هور + بوو = هورهوربوو

**١١- ڕەگی کار + کاری سادە = کاری لێکدراو**

پرس + کرن = پرسکرن

خەڤ + هاتن = خەڤهاتن

**١٢ـ ئاوەڵناوی داڕژاو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

بەهێز + کر = بەهێزکر

سەر + هلدا = سەرهلدا

کێم + کرەڤە = کێمکرەڤە

زۆر + کرەڤە = زۆرکرەڤە

**١٩. ئاوەڵکاری داڕژاو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

ژناو + چوو = ژناوچوو

ژبن + بر = ژبنبر

ژناو + بر = ژناوبر

ژبەر + کر = ژبەرکر

**٢٠. وشەیەک مانای سەربەخۆی نەبێت + کاری سادە = کاری لێکدراو**

واز + هێنا = وازهێنا

نقووم + بوو = نقوومبوو

فرێ + دا = فرێدا

**٢١- ئامرازی سەرسوڕمان + کاری سادە = کاری لێکدراو**

ئاخ + خارن = ئاخخارن

داخ + خارن = داخخارن

**٢٢- ئامرازی سەرسوڕمان + کاری داڕژاو = کاری لێکدراو**

ئاخ + هلکێشان = ئاخ هلکێشان

**٢٣. ژمارە + کاری سادە = کاری لێکدراو**

ئێک + گرت = ئێکگرت

نەخۆش + کەفت = نەخۆشکەفت

**١٣. ئاوەڵناوی لێکدراو + کاری سادە = کاری لێکدراو**

دڵخۆش + کر = دڵخۆشکر

دڵشاد + بوو = دڵشادبوو

**١٤. ئاوەڵناوی سادە + کاری داڕژاو = کاری لێکدراو**

نوێ + کرەڤە = نوێکرەڤە

تیژ + کرەڤە = تیژکرەڤە

**١٥. ئاوەڵناوی داڕژاو + کاری داڕژاو = کاری لێکدراو**

بەئاگا + هاتەڤە = بەئاگاهاتەڤە

بەهێز + بووەوە = بەهێزبووەوە

**١٦. ئاوەڵناوی لێکدراو + کاری داڕژاو = کاری لێکدراو**

دڵسار + کرەڤە = دڵسارکرەڤە

دڵخۆش + کرەڤە = دڵخۆشکرەڤە

**١٧. ئاوەڵکاری سادە + کاری سادە = کاری لێکدراو**

زۆر + کر = زۆرکر

سەر + کەفت = سەرکەفت

کێم + کر = کێمکر

پێش + کەفت = پێشکەفت

کێم + بوو = کێمبوو

**١٨. ئاوەڵکاری سادە + کاری داڕژاو = کاری لێکدراو**

ئێک + بوو = ئێکبوو

**سێیەم: کار لە ڕووی هێزەوە**

کار لە ڕووی هێزەوە دەکرێتە دوو بەش:

**أ. کاری تێپەڕ**

کاری تێپەڕ ئەو کارەیە، کە کاریگەریی هێزەکەی لە بکەرەوە تێدەپەڕێت بۆ سەر کەرەستەیەکی تر، ئەویش بەرکاری ڕاستەوخۆیە، واتە کاری تێپەڕ بەرکاری ڕاستەوخۆ وەردەگرێت. وەک:

- ئازادی سێڤ خار.

لەم ڕستەیەدا وشەی (ئازاد) بکەری ناو ڕستەکەیە و، بە خواردنی شتێک هەستاوە، کە ئەویش (سێڤ)ە، هێزەکەش لێرەدا کەوتۆتە سەر بەرکاری ڕاستەوخۆ، کارەکەش کە (خار)ە، کارێکی تێپەڕە. دەبێت ئەوەش بوترێت کە لە زمانی کوردیدا هەموو کارێکی تێپەڕ لەناو ڕستەی سادەدا، یەک بەرکاری ڕاستەوخۆ وەردەگرێت، بەڵام بۆ بەرکاری ناڕاستەوخۆ، ئەوا دەشێت لە ڕستەی کاری تێپەڕدا بەرکارێکی ناڕاستەوخۆ یان زیاتر ببینرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار لە ڕستەی کاری تێپەڕدا، وا دەبێت بەرکارەکەی لە ڕووی سیما (ڕوخسار)ەوە بە دیارناکەوێت، کە ئەمەش وای لە زۆر کەس کردووە بە هەڵەدا بچن و بڵێن ئەم ڕستەیە بەرکاری تێدا نییە، بەڵام لە ڕووی واتاوە بەرکارێک لەناو ڕستەکەدا دەبینرێت، وەک ( ئازادی پێدڤێ بنڤیسی)، لێرەدا لە ڕووی ڕووخسارەوە بەرکار دەرنەکەوتووە، بەڵام لە ڕووی واتاوە

بەرکار دەرکەوتووە، چونکە ئازاد دەتوانێ شتێ بنووسێ، جا ئەم شتە نامەیە . وتارە . شیعرە. یا هەر شتێکی تر ...

کاری تێپەڕ لە ڕووی هەبوونەوە، بە سەر دوو جۆر دابەش دەبێت :-

**١ـ تێپەڕی ڕەسەن(بنجی):** ئەو کارە تێپەڕانە دەگرێتەوە،کە لە بناغە و بنجدا تێپەڕن، وەک ( بر، کر، کڕی، شویشت، خار،....).

**٢ـ تێپەڕی نارەسەن(نابنجی):** ئەو کارە تێپەڕانە دەگرێتەوە، کە لە بناغەدا تێنەپەڕن، بەڵام بەهۆی پاشگری (- اندن) بوونەتە کارێکی تێپەڕ. وەک :-

**خەفتن ← خەف + اندن = خەفاندن**

**مرن ← مر + اندن = مراندن**

**لڤین ← لڤ + اندن = لڤاندن**

**نڤستن ← نڤ + اندن = نڤاندن**

هەروەها هەندێک کاری تێنەپەڕمان هەیە، کە بەرانبەرەکەیان کاری تێپەڕی هەیە، لەوانە[1]:

| تێنەپەڕ | | تێپەڕ |
|---|---|---|
| کەفتن | ← | ئێخستن |
| هاتن | ← | ئێنان |
| بوون | ← | کرن |
| چوون | ← | برن |

١. لیژنەی زمان و زانستەکان، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل١٢٣.

ڕۆیشتن ← نارن
ڕژان ← ڕشتن
گۆڕان ← گۆڕین
سڕانەوە ← سڕینەوە
پچڕان ← پچڕین
بزووتن ← بزاوتن
سوان ← سوین (سوون)
قەلشتن ← قەڵاشتن
قڵیشان ← قەڵاشتن
مانەوە ← هێشتنەوە، هێلانەوە
مان ← هێشتن، هێلان
کشانەوە ← کێشانەوە
هەڵستان ← هەڵگرتن

هەروەها هەندێک کاری تێنەپەڕمان هەیە، دەشێت بەهۆی (-اندن)ەوە بکرێنە تێپەڕ، سەرەڕای ئەوەش کاری تێپەڕی بەرانبەریان هەیە، وەک :

<u>تێنەپەڕ</u> <u>تێپەڕ</u>
کەفتن ← کەواندن، ئێخستن
مرن ← مراندن، کوشتن
چوون ← چواندن، برن

لێرەدا لە زۆر حاڵەتدا مانای تێپەڕی بەرانبەر و بە تێپەڕکراوەکە وەک یەک نابن، وەک (مردن) تێپەڕی بەرانبەری

(کوشتن)ە و، دەکرێت بە (مراندن)، بەڵام لە ڕووی واتاوە (مراندن) و (کوشتن) جودان [1]، وەک :

**ـ پیاوەکە خۆی کوشت – لێرە مردووە**

**ـ پیاوەکە خۆی مراند - لێرە نەمردووە**

هەروەها هەندێک کاری تێنەپەڕمان هەیە، کە بەرانبەریان کاری تێپەڕی نییە و پاشگری(ـ اندن)یش وەرناگرن، وەک[2]:( **سرەوتن، نیشتن، زان، گەنین**)، دیارە لێرەدا ئەم وشانە ڕوودانیان لە ژوور ئارەزوو و دەسەڵاتی مرۆڤدا نییە، چونکە ((تۆ دەتوانی یەکێکی تر(بخەوێنی و یا بشێوێنی) بەهۆی ئەو ئامرازانەوە، کە خەوتن و شێوان پەیدا دەکەن، بەڵام ناتوانی لە دەروونی هەمان کەسدا (سرەوتن) پەیداکەیت، چونکە سرەوتنەکە لەلاوە نایەت بۆی ....)).[3]

هەروەها هەندێک کاری تێنەپەڕ، بە یارمەتی کاری یارمەتیدەری (هێنان) و (خستن)ەوە دەکرێنە تێپەڕ، وەک:

**منداڵەکەی هێنایە پێکەنین .**

**منداڵەکەی خستە گریان .**[4]

ئەگەرچی لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد، کە پاشگری (- اندن) کاری تێنەپەڕ دەکاتە تێپەڕ، هەروەها دەوری ڕۆنانی کاری

---

١ـ وریا عومەر ئەمین، ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، ل١٨٨.

٢ـ ئەوڕەحمانی حاجی مارف(د)، کردار، ل ٥٨.

٣ـ لیژنەی زمان و زانستەکانی، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل١٢٣.

٤ـ عومەر مەحموود کەریم، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٩.

تێنەپەڕیش دەبینێت، بەتایبەتی کاتێک کە دەچێتە سەر ناوی دەنگە سروشتییەکان و دەیانکات بە کاری تێنەپەڕ، وەک:

**قیژە + اندن = قیژاندن**

**گرمە + اندن = گرماندن**

**باعە + اندن = باعاندن**

**زیڕە + اندن = زیڕاندن**

**باڕە + اندن = باڕاندن**

هەروەها (- اندن) چەندین ئەرکی تری جودا جودا دەبینێت، لەوانە چاوگی لێکدراو دەکات بە چاوگی داڕژاو، وەک :

**نەخشکردن ← نەخشاندن**

هەروەها کار و چاوگی بێگانەی تێپەڕ، بەتایبەتی لە زمانی عەرەبی دەکاتە کوردی و هەر بە تێپەڕیش دەمێنێتەوە و، هەموو تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردی وەردەگرێت، وەک:

**"شبه" + اندن = شوبهاندن**

**خلق + اندن = خولقاندن**

**ب- کاری تێنەپەڕ:**

کاری تێنەپەڕ ئەو کارەیە، کە کاریگەری هێزەکەی لە بکەرەوە تێناپەڕێت بۆ سەر بەشێکی تر، بەو واتایەی ناچێتە سەر بەرکاری ڕاستەوخۆ، واتا خاڵی جیاکردنەوەی تێنەپەڕ لە تێپەڕ، بەرکاری ڕاستەوخۆیە، بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر، با سەیری ئەم نموونەیە بکەین :

**- سەردار کەڤت .**

لەم ڕستەیەدا وشەی (سەردار) بکەری ناو ڕستەکەیە و، کارێکی ئەنجامداوە، ئەویش (کەڤت)ە، هێزەکەی لەناو ڕستەدا تەنیا لە دەوری بکەر جێگیر بووە و نەچۆتە سەر کەرەستەیەکی تر و، کاری (کەڤت)یش کارێکی ڕابوردووی تێنەپەڕە، ئەم ڕستەیەی سەرەوەش بە تەسکترین ڕستەی کاری تێنەپەڕ دەژمێردرێت، کە تەنیا (بکەر)ی لەناو ڕستەدا وەرگرتووە، بەڵام دەشێت لە شوێنی تردا کاری تێنەپەڕ، جگە لە(بکەر) لەگەڵ چەندین کەرەستەی تردا دەرکەوێت، لەوانە (بەرکاری ناڕاستەوخۆ).

لە زمانی کوردیدا کاری تێنەپەڕ لە ڕووی هێزەوە دوو جۆرە:

**١- تێنەپەڕی خوازەکی:** لەم جۆرە کارانەدا دەوری (بکەر) شتێکی ئاشکرا و ئیرادییە، وەک :

**. ئازاد چوو .**

**. ڤەژین ڕۆیشت.**

لێرەدا کارە تێنەپەڕەکانی (چوو، ڕۆیشت)، پێویستییان بە بکەری ڕاستەقینەی ناو ڕستەکە هەیە بۆ هەڵسوڕانی کارەکە.

**٢- تێنەپەڕی ڕوودان :** لەم جۆرەدا، بکەر دەورێکی تایبەتی خۆی نییە، بەو واتایەی کە ئیشەکە بەبێ ویستی بکەر دێتە دی، وەک :

**. ئاڤەکە ڕژا.**

**. شوشەکە شکەست.**

**. سەردار کەڤت.**

لەم ڕستانەدا کارە تێنەپەڕەکانی (ڕژا، شکەست، کەڤت) پێویستییان بە دەرکەوتنی بکەرەکە نییە، هەروەها ڕۆڵی بکەر بەدەرناکەوێت.

دەبێت لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین، کە لە زمانی کوردیدا ناشێت کارێکی تێپەڕ بۆ کاری تێنەپەڕ بگۆڕدرێت، واتە کارە تێنەپەڕەکان تەنیا ئەو کارانە دەگەڕێتەوە، کە لە بنجدا تێنەپەڕن .

# ئــاوەڵکــــار

## چەمک و پێناسەی ئاوەڵکار

لە زمانی کوردیدا جگە لە زاراوەی **(ئاوەڵکار)**، زاراوەکانی **(ئاوەڵفرمان، ئاوەڵکار، ئادڤێرب، هاوەڵکار)** بەکاردێن. ئاوەڵکاریش بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە وەسفی کارێک لە ڕستەکەدا دەکات، چونکە کات و شوێن و چۆنیەتی و چەندیەتی.....**هتد** کارەکە لە ڕستەدا دەستنیشان دەکات، ئاوەڵکار دۆست و هاوڕێی کارە، چونکە هەمیشە لەگەڵ کار دێت، واتە پەیوەستە بە کارەکەوە، ئەمەش پێچەوانەی ئاوەڵناوە، چونکە ئاوەڵناو دۆست و هاوڕێی ناو و جێناوە، کە بەهۆیەوە وەسفیان دەکات.

## جۆرەکانی ئاوەڵکار

### یەکەم/ جۆرەکانی ئاوەڵکار لە ڕووی واتاوە

**١. ئاوەڵکاری کاتی**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێ، کە کاتی ڕوودانی کار دەستنیشان دەکەن. ئاوەڵکاری کاتی لە ڕستەدا وەڵامی وشەی (کەی) دەداتەوە.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، وشەکانی (**ئیرۆ، ئەڤرۆ/ ئەڤرو، نها/ نهۆ، دوهی/ دوهێ، پێر، شەڤێ، سپێدێ، سبا، بەرێ، ئێڤارێ، ئیڤارا... هتد**) بەکاردێن، وەک:

**- ئەز سپێدەهیان وەرزشێ دکەم[1].**

**- دوهێ ئەزموونێن مە ب دوماهی هاتن.**

**- ئەڤرۆ گەلێن جیهانێ بۆ ئاشتیێ خەباتێ دکەن.**

**- ل هاڤینێ پتریا خەلکی ل سەربانی دنڤن.**

---

[1]- عەبدولسەلام نەجمەدین و سەلوا فەریق، ڕێزمانا کوردی بۆ زارۆکان، ل ١٠٠.

### ٢. ئاوەڵکاری شوێنی

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە شوێنی ڕوودانی کارەکە دەست نیشان دەکەن، هاوەڵکاری شوێنی وەڵامی وشەی (**کوێ - کیڤە**) دەداتەوە.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، وشەکانی (**نک، کن، ژووریٚ، ب رەخ، ژێری، خوار/ ل خواریٚ/ ژخاریٚ، بن، ناڤ/ دناڤ، بنڕا، ڤڕا،.. هتد**) بەکاردێن، وەک:

- **کتێبێ مە ل نک ڕزگاری بوو.**
- **کاوە ل بن داریٚ دخوینیت.**
- **مەلەڤان دناڤ ئاڤێدا بوو.**

### ٣. ئاوەڵکاری چۆنیەتی

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە چۆنیەتی ڕوودانی کارەکە دەستنیشان دەکەن، هاوەڵکاری چۆنیەتی وەڵامی وشەی (**چۆن - چەوا**) دەدەنەوە.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، وشەکانی (**بلەز/ ب لەز، ب جوانی، ب خۆشی، ب ژیری، خۆش،.......هتد**) بەکاردێن، وەکو:

- **ئەز بلەز چوومە ناڤ زانکۆیێ.**
- **ویٚ چیرۆک خۆش دگۆت.**

- **نازداریّ بلەز هاتە نک مە.**

### ٤. ئاوەڵکاری چەندێتی

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە چەندێتی ڕوودانی کاری ناو ڕستە دەستنیشان دەکەن، ئاوەڵکاری چەندێتی وەڵامی وشەی (چەند - چقاس) دەداتەوە.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا وشەکانی (**فرە، زۆر، پیچێک/ پیچەک، کێم، گەلەک...هتد**) بەکاردێن، وەکو:

- **ئازادی پیچەک ئاڤ ڤەخار.**
- **بەفر ل کوردستانیّ گەلەک دباریت.**

### ٥. ئاوەڵکاری ڕێکخستن

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە شێوە و جۆری جێبەجێکردنی کارەکە دەخاتەڕوو. ئاوەڵکاری ڕێکخستن وەڵامی وشەی (بە چ چەشنێک - چ جۆرە) دەداتەوە.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، وشەکانی (**پێکڤە، ب گشتی، هێدی هێدی، کێم کێم، ئێک ئێک... هتد**) بەکاردێن، وەک:

- **ئەز هێدی هێدی چوومە ماڵ**[1].

---

١. عەبدولسەلام نەجمەدین و سەلوا فەریق، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٢.

**- مه لمال بگشتی کاردکەین.**

**٦- ئاوەڵکاری نەرێنی (نەفی)**

ئەو ئاوەڵکارەیە کە نەرێنی کارەکە دەستنیشان دەکەن، . ئەو وشانەی بۆ مەبەستی ئاوەڵکاری نەرێنی بەکاردێن بریتین لە (**هەرگیز، هەرگیزاوهەرگیز، بەهیچ شێوەیەک، بەهیچ ڕەنگێک، بەهیچ کلۆجێک ...**).

**- مه ب هیچ کلۆجێک کار نکەین.**

**٧. ئاوەڵکاری جەختکردن (دڵنیایی)**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت، کە جەخت لەسەر ئەنجامدان و جێبەجێکردنی کار دەکەنەوە. ئەو ئاوەڵکارانەی، کە بۆ مەبەستی جەختکردن بەکاردێن، بریتین لە (**هەر، هەڵبەت، بێگومان، بێشک، بێ سێ و دوو....**).

**- هەردچم بو ئەڤ مالا.**

**- هەڵبەت کارەکە ناکەین.**

**بێگومان لە شەڕەکە سەردەکەوین.**

**٨. ئاوەڵکاری دووبارەکردنەوە**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە دووبارەکردنەوە و دووپاتکردنەوەی کارێک ڕادەگەیەنن.ئەو وشانەی کە بۆ مەبەستی ئاوەڵکاری

دووپاتکردنەوە بەکاردێن بریتین لە (**دووبارە، دیسان، سەرلەنوێ، جارێکی دی، جارێکی تر، جارەک دن .......هتد**). وەک:

- **وێ جارەک دن هاتەڤە.**

**٩. ئاوەڵکاری هۆ و مەبەست**

بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە هۆی ڕوودانی کارێک لەگەڵ مەبەست لە جێبەجێکردنی کارێک دەخەنە ڕوو. ئاوەڵکاری چەندێتی وەلامی وشەی (بۆچی ـ ژ بەرچی) دەداتەوە.

ئەو وشانەی کە بۆ مەبەستی ئاوەڵکاری هۆ و مەبەست بەکاردێن، بریتین لە (**ژبەرئەوە، ژبەرئەوەی، چونکی، ژبرسا، ژترسا، بخۆڕایی، ب ئەنقەست.....**).

- **ئازادی نەهاتینە خوێندنگەهێ، چونکی نخۆشە.**
- **نەسرینێ ژبرسا مر.**

**دووەم: جۆرەکانی ئاوەڵکار لە ڕووی پێکهاتنەوە**

ئاوەڵکار لە ڕووی پێکهاتنەوە بەسەر (سادە و دارڕژاو و لێکدراو) دابەش دەبێ:

**١. ئاوەڵکاری سادە:** بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە لە یەک وشەی واتاداری سەربەخۆ پێکدێت، وەک (نک, خێرا، هێندێ، هێمن، باش، خراپ، زۆر، فرە، نها، پار، سەر، ژێر, .....).

٢. **ئاوەڵکاری دارِژاو:** بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت، کە لە ئاوەڵکارێکی سادە لەگەڵ پێشگرێک یاخود پاشگرێک یاخود هەردووکیان پێکدێت، وەک (بێگومان، بێشک، بێناز، بێوچان، بەتەنیا، بەپەلە .....). یاساکانی سازکردنی ئاوەڵکاری دارِژاو بەم شێوەیەی خوارەوەن:.

**١. پێشگر + ناو = ئاوەڵکاری دارِژاو**

ب + ناز = بناز

بە + شەڤ = بشەڤ

بێ + گومان = بێگومان

**٢. ناو + پاشگر = ئاوەڵکاری دارِژاو**

ڕۆژ + ێ = ڕۆژێ

پیاو + انە = پیاوانە

**٣. پێشگر + ناو + پاشگر = ئاوەڵکاری دارِژاو**

بە + پیاو + ەتی = بەپیاوەتی

بێ + باک + انە = بێباکانە

ب + برا + تی = ب برایەتی

**٤. پێشگر + ئاوەڵناو = ئاوەڵکاری دارِژاو**

ب + پەلە = بەپەلە

ب + خێرا = ب خێرا

**٥. ئاوەڵناو + پاشگر = ئاوەڵکاری دارِژاو**

دلێر + انە = دلێرانە

مەرد + انە = مەردانە

**٦. پێشگر + ئاوەڵناو + پاشگر = ئاوەڵکاری دارِژاو**

ب + جوان + ی = ب جوانی

ب + سار + ی = ب ساری

**٧. پێشگر + ئاوەڵکاری سادە = ئاوەڵکاری دارِژاو**

ل + ژێر = ل ژێر

ل + ناڤ = ل ناڤ

ل + نک = ل نک

٣. **ئاوەڵکاری لێکدراو:** بەو ئاوەڵکارانە دەوترێت کە لە دوو وشە یاخود زیاتر پێکدێن. یاساکانی سازکردنی ئاوەڵکاری لێکدراو بەم شێوەیەی خوارەوەن:.

**١. دووبارەکردنەوەی ناو، ژمارە، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار. وەکو:**

دەستە دەستە، تاقم تاقم ................ (ناو)

ئێک ئێک ، چار چار ................... (ژمارە)

هێدی هێدی ، هورد هورد............. (ئاوەڵناو)

کێم کێم، بلەز بلەز .......................(ئاوەڵکار)

**٢. دووبارەکردنەوەی وشەیەک لەگەڵ کەرەسەکانی (او، ەو، بە، لە).وەکو:**

پشتاوپشت، دۆلاودۆڵ، بانەوبان، پاشەوپاش، شاخەوشاخ، ڕۆژبەڕۆژ، ئێک بە ئێک،.....

**٣. ئاوەڵناو + بە + ناو = ئاوەڵکاری لێکدراو**

پڕبەدەم، پڕبەدڵ

**٤. ژمارە + ناو یاخود ئاوەڵکار = ئاوەڵکاری لێکدراو**

ئێکجار، ئێکسەر، ئێکشەممە، نیڤەڕۆ ......

**٥. وشەی (هەر) + ناو، ژمارە، ئاوەڵکار = ئاوەڵکاری لێکدراو**

هەردەم، هەردوو، هەرلا ............

**٦. وشەی (ئەڤ) + ناو = ئاوەڵکاری لێکدراو**

ئەڤشەو، ئەڤساڵ......

**٧ـ پێشگری (ل) + سەر + ئاوەڵکاری سادە = ئاوەڵکاری لێکدراو**

لسەرلا، لسەر پشت...

**٨ـ ناو + ەو + ئاوەڵکاری سادە = ئاوەڵکاری لێکدراو**

سەر + ەو + خوار = سەرەوخوار..........

**٩ـ وشە + و + وشە = ئاوەڵکاری لێکدراو**

تێروپڕ، جاروبار، گورجوگۆڵ..........

**١٠ـ پێشگر + ئاوەڵناوی لێکدراو + پاشگر = ئاوەڵکاری لێکدراو**

ب + دڵشکاو + ی = بەدڵشکاوی

**١١ـ ئاوەڵکار + ناوبەند + ئاوەڵکار = ئاوەڵکاری لێکدراو**

سەر + ان + سەر = سەرانسەر

**١٢ـ ئاوەڵکار + نا + ئاوەڵکار = ئاوەڵکاری لێکدراو**

پار + نا + پێرار = پارنا پێرار

دوێنێ + نا + پێرێ = دوێنێ ناپێرێ

# ژمارە

## چەمک و پێناسەی ژمارە

بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن، کە ڕێژە و ئەندازە و ژمارەی کەرەستەکان لە ڕستەدا دیاری دەکات.

بەشە ئاخاوتنی ژمارە یەکێکە لەو بابەتانەی کە گیروگرفتێکی زۆری لەسەرە، چونکە زۆربەی قوتابخانە زمانەوانییە نوێیەکان, بەتایبەتی (ئەمریکی و بەریتانی) لەسەر ئەو باوەڕەن، کە ژمارە بەشە ئاخاوتنێکی سەربەخۆ نییە، بەڵکو بەشێکە لە بەشە ئاخاوتنی ئاوەڵناو، یان هەندێ لە زمانەوانە کوردەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ژمارە بەشە ئاخاوتن نەبێ، بەبێ لەبەر چاوگرتنی خاسیەتی تایبەتی زمانی کوردی، دەبێ ئەوەش بوترێ کە لە قوتابخانەی زمانەوانی ڕووسی (مۆسکۆ) لەبارەی پۆلێنکردنی بەشە ئاخاوتنەکان، ژمارە بە بەشە ئاخاوتنێک سەیر دەکات.

## پۆلێنکردنەکانی ژمارە

**یەکەم: ڕێگاکانی دروستکردنی ژمارە**

هەردوو ڕێگـای کـۆکردنەوە و لێکـدان پەیوەنـدی زمـان بە ماتماتیکەوە دەردەخات، بەهۆیەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە تا چەند ئەم دوو زانستە پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە.

لە زمـانی کوردیـدا ڕێگاکـانی دروسـتکردنی بەشـێک لە ژمـارە، بەمشێوەیەی خوارەوەن:

**١. ڕێگای کۆکردنەوە:**

بەهـۆی کـۆکردنەوە دوو ژمـارە دەدرێـنە پـاڵ یەکتـرەوە، ئەم ڕێگـایە لەسـەر بەشـێکی زۆری ئەو ژمـارانە ئەنجـام دەدرێت، کە لە سەرووی یازدەوەن، بۆ نموونە :

**چار + دە = چاردە**

**چل + شەش = چل و شەش**

**پەنجا + پێنج = پەنجاوپێنج**

**هەشت + دە = هەژدە**

ئەگەر سـەیرێکی ئەم نموونـانەی سـەرەوە بکەیـن، دەبینـین جیـاوازی لە نێوانیانـدا هەیە، بە جۆرێـک وشـەکانی ژمـارە (چـاردە، شـازدە، حەڤـدە،......) ژمـارەی لێکـدراون، بەبـێ ئەوەی بەهـۆی ئـامڕازەوە بچـنە پـاڵ یەکتـرییەوە، کەچـی ژمارەکـانی (چلوشـەش، بیسـتویەک، بیسـتودوو، پەنجـاوپێنج .....)، کە ژمـارەی لێکـدراون،

بەڵام بەهۆی ئامرازی بەیەکبەستنی (و) بەستراون، ئەمە لەلایەکەوە و لەلایەکی ترەوە هەندێ لەو ژمارانە لە کاتی چوونە پاڵ یەکتری و سازکردنی ژمارەی لێکدراو، دیاردەی فۆنۆلۆجی ڕوودەدەن، وەک :

**هەشت + دە = هەژدە**

**نۆ + دە = نۆزدە**

لە نموونەی یەکەمدا، دەنگی (ش) گۆڕاوە بۆ (ژ). لە نموونەی دووەمدا دەنگی (ز)پەیدابووە.

**٢. ڕێگای لێکدان:**

ئەو ژمارانە دەگرێتەخۆ، کە بەهۆی لێکدانەوە سازدەکرێن. وەک:

دوو × سەد = دووسەد

چار × هەزار = چار هەزار

شەش × ملیۆن = شەش ملیۆن

## دووەم: ژمارە لە ڕووی پێکهاتنەوە

**١. ژمارەی سادە:**

بەو ژمارانە دەوترێت، کە لە یەک وشەی واتادار پێکدێن، وەک (ئێک، دوو، سێ، چار، پێنج، حەفت،....)، (بیست، سی، چل)....هتد.

**٢. ژمارەی دارڕژاو:**

بەو ژمـــارانە دەوترێـــت کە لە ژمـــارەیەکی ســـادە لەگەڵ پێشگرێک یاخود پاشگرێک یان هەردووکیان پێکدێت، وەک (پەنجا، حەفتا، هەشتا، ......)...هتد.

**٣. ژمارەی لێکدراو:**

بەو ژمـارانە دەوترێت، کە لە دوو ژمـارە یـان زیـاتر پێکـدێن، وەک (چاردە، سیوسێ، بیستوحەوت، دووهەزاروشەش ...)...هتد.

**سێیەم: ژمارە لە ڕووی واتاوە**

**١. ژمارەی بنجی:**

بەو ژمـارانە دەوترێت کە ژمـارەی ڕاسـتەقینە و بنچینەیـی لە خۆدەگرێت، واتە هەمـوو ژمـارە سـەرەکییەکان لە خۆدەگرێت، وەک (ئێـــک، دوو، سێهـــ، بیســـت، چـــل، ســـەد، دووســـەد، هـــزار، ملیۆن...)...هتد.

- **سێهـ قوتابیێن چوون.**
- **دوو پیاو مرن .**

گەلەک جار ژمارەکانی (دەهـ، سەد، هزار....) بەهۆی زیـادکردنی نیشـانەی (ان)، ژمارەیـەکی تـەواوت بـۆ دەستیشـان ناکـات، بـەڵکو دەبێتە ژمارەیەکی ڕێژەیی، وەک:

- **ب هزاران کەس بوونە قوربانیێن کارەساتە هەلەبجێ.**

ژمارەی بنجی لەنێو ڕستەدا چەند تایبەتمەندیەکی هەیە، لەوانە:

دەشـێ دوو ژمـارەی بنجـی بە یـارمەتی ئـامڕازی (و) بێـت، و دەشێ بەبێ ئامڕازی (و) بێت، وەکو:

**- سێ چار قوتابیێن چوون.**

**- پێنج شەش کێلۆیێن برنجی بینە.**

**- ئەز چوومە دووسێ باژێران.**

**- قوتابیانییێن پێنج و شەش تاقیکردنەوەیان هەیە.**

بۆ دەرخستنی بڕی شتێک، ئەوە وشەیەک لەگەڵ ژمارەی بنجی دەردەکەوێت، بەیەکەوەش دەبنە وشەیەکی لێکدراو، وشەکانیش بریتین لە (سەر، دەستە، بەرگ، پارچە، دانە،......هتد). وەکو:

**- ئێک دەستە پێنووسم کڕی.**

**- سێهـ بەرگ پەرتووکێن فرۆت.**

**- ئێک پارچە زەڤییێن هەنە.**

<u>تێبینی:</u>

١. یەکێک لە خاسیەتەکانی ژمارەی بنجی ئەوەیە، کە دەشێ بە ژمارە (ڕەقەم) بنووسرێت، کە ئەمەش جیای دەکاتەوە لە تەواوی بەشە ئاخاوتنەکانی تر، وەک:

**چار پیاو چوون.**

**٤ پیاو چوون.**

٢. لە هەمان کاتیشدا ناو واتای چەندێتی تێدایە، وەکو لەمانەی خوارەوە بۆمان دەردەکەوێت:

(چلە، سەدە، حەفتە، ......),(چل، سەد، حەفت، .....), دیارە لێرەدا جیاوازییەکی ڕوون و ئاشکرا لە نێوانیاندا هەیە، چونکە (چلە، سەدە، حەفتە، .....) لە ڕووی بەشە ئاخاوتنەوە, بەشە ئاخاوتنی

ناون، لە ڕووی پێکهاتنەوە داڕژاون، ناتوانرێت بە ژمارە بنووسرێن، بەڵام (چل، سەد، حەفت.....) لە ڕووی بەشە ئاخاوتنەوە، بەشە ئاخاوتنی ژمارەن، لە ڕووی پێکهاتنیشەوە سادەن، دەشێ بە ژمارەش بنووسرێن.

٣. ئەو وشانەی لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی ژمارە دێن، دەشێت ناسراو بن یان نەناسراو، تایبەتی، گشتی، تاک، یان کۆ،.....وەکو :

**ـ دوو پیاو هاتن .**

**ـ دوو پیاوەکە هاتوون .**

٤. ژمارەی (ئێک) کاتێک کە لەگەڵ ناوێک دێت، دەشێ وەک نیشانەیەکی نەناسراوی دەرکەوێ.وەکو:

**ـ ئێک کور هاتییە.**

**ـ کورێک هاتییە.**

**ـ ئێک کەچ زیرەکە.**

**ـ کەچێک زیرەکە.**

ئێک : وەک بەشە ئاخاوتنی ژمارە دەرکەوتووە، سەربەخۆیە.

ێک : نیشانەی نەناسراوە، کەوتۆتە دوای ناوەکە.

**٢. ژمارەی ڕێکخستن:**

بەو ژمارانە دەوترێت، کە ئەندازە و ڕێکخستنی کەرەستەکە دەگەیەنێت، لە زمانی کوردیدا دوو یاسای تایبەتیمان هەیە بۆ سازکردنی ژمارەی ڕێکخستن، کە ئەوانیش بریتین لە:

**بنجی + ێ = ڕێکخستن**

ئێک + ێ = ئێکێ

چار + ێ = چارێ

**بنجی + ان(انی) = ڕێکخستن**

بیست + ان = بیستان

ئێک + انی = ئێکانی

**بنجی + وم = ڕێکخستن**

چار + وم = چاروم

- ژ بیستوئێکێ ئاداری نەورۆز دهێت.
- ئەز ل ئێکێ گولانێ دچم.
- یاریکەرا سێیێ دەرچوو.
- ڤیان دەرچوویێ ئێکێ خوێندگەهێیا.

**٣. ژمارەی کەرتی:**

بەو ژمارانە دەوترێت، کە ڕێژە و ئەندازەی کەرتەکە دیاری دەکات، بەو واتایەی چەندیتی دەگەیەنێت . لەم جۆرەدا دەبێت خانەی ژمارەکان بزانین ئەمە لەلایەک و لەلایەکی ترەوە زۆرجار بە یاریدەی وشەی (ژسەر) یا پێشبەندی (ژ) ژمارەی کەرتی سازدەکرێت، بەجۆرێک پێشبەندی (ژ) یا لەسەرەتای دەستەواژەکەوە دێت، واتە لەپێش ژمارەیەکی گەورەوە دێت و ژمارە بچووکەکەش دەکەوێتە دوای خۆیانەوە،[1] وەکو:

---

١ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٢٥٣ ـ ٢٥٤.

**- ژ هەزارا چل قوتابیێن دەرچوون.**

یانیش هەندێ جار پێشبەندی (ژ) دەکەوێتە نێوان دوو ژمارەکەوە، وەکو:

**- پێنج ژ سەدی پارەکەم دڤێ.**

**- ئێک ژ پێنجی پەزەکانم کڕی.**

یا بەهۆی وشەی (ژ) کە دەکەوێتە نێوان هەردوو ژمارەکەوە، وەکو:

**- دوو ژ سەر پێنجی قوتابییێن ئامادەبوون.**

**- چار ژ سەر هەشتێ کتێبێن ئێنا.**

**- ئێک ژ سەر چاری کتێبێن کڕی.**

**- ژ سەدی دەهێ قوتابیێن دەرچوون.**

هەندێجار بەهۆی زیاردکردنینیشانەی (یەک - ئێک) بۆ سەر ژمارەی بنجی، ژمارەی کەرتی سازدەکرێت، وەک:

**- چارێک سەعەتا دی خوە بگرن.**

## پێشبەند (پرێپۆزیشن)

بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن کە بە تەنیا بەکارنایەت، بەڵکو پێویستی بە کەرەسەی تر هەیە, بۆ ئەوەی واتا ببەخشێت، ئەگەرچی پێشبەند لە بنچینەدا واتای شوێنی و ئاڕاستەکردن دەگەیەنێت، بەڵام هەر واتا ناگەیەنێت.

وەکو ئاماژەمان بۆی کرد، کە پێشبەند لە پێش ناوێک یان جێناوێک دێن یان لە دوای کارێک دێن، بۆ پیشاندانی پەیوەندی نێوان ئەو ناوە یان ئەو جێناوە یان ئەو کارە لەگەڵ ناوێکی تری نێو ڕستەکەدا.

لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا، پێشبەند (پرێپۆزیشین)ەکان بەمشێوەیەی خوارەوەن:

**پێشبەندی(ل):** ئەم پێشبەندە بەرانبەر بە (لە) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:

- **چیمەنتو ل ئاخ و بەرا چێدکەن**[1].
- **سەردار ل مالێ ڕۆنیشتییە.**
- **نەسرینێ ل مال نەبوو.**

---

١. محمد طاهر گوهەرزی، ڕێزمانا کوردی ـ زارێ کرمانجی، چاپخانەی خەبات، دهۆک، ١٩٩٩، ل ١٥٤.

ئەم پێشبەندە لە شێوەی ناسادەشدا دەبینرێ، کاتێ لەگەڵ پاشبەندەکانی (دا، ڕا، ڤە) دێت، وەک:

**- ل هەڤلێردا ئاکنجیمە.**

**پێشبەندی(ژ, د):** ئەم پێشبەندە بەرانبەر بە (لە) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:

**- ڕۆژا بیست و یەکێ ژ هەیڤا سێێ جەژنا نەورۆزێیە**[1].

**- ئازادی نامە ژ هەڤلێرێ هنارتییە.**

**- ڤەژین د کەرکوکێرا هاتییە.**

**- سالار د مالدا کاردکەت.**

**پێشبەندی (ب):** ئەم پێشبەندە بەرانبەر بە (بە) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:

**- ب دەستێ خەڵکی مار دگرە**[2].

**- سال ب سال خوزییا سالا پار.**

**- مەلەڤان ب باسک و ملا مەلەڤانە.**

**- شەر ب چەکی، بازار ب دراڤی.**

**- ئەسپ و زین ب هەڤڕا هاتنە دزین**[1].

---

١. ئیبراهیم ڕەمەزان زاخۆیی، ڕێزمانا کوردی، دەزگای سپیرێز بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، دهۆک، چاپخانەی خانی، ٢٠٠٨، ل ٦٣.

٢. ک. ک. کوردۆیێڤ، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، و: کوردستان موکریانی، هەولێر، ١٩٨٤، ل ٣٢٣.

**- نەسرینێ ب کێرکێ دەستێ خۆ بڕی.**

ئەم پێشبەندە لەگەڵ پاشبەندەکانی (را، ڤە، دا)، پێشبەندی ناسادە پێکدەهێنن و ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن.[٢]

**- ئەزێ ب زمانێ وی ب ویرا خەبەردم.**

**- مللەتێ کورد ب بچویک و مەزنڤە سەهلدا.**

**- ئەز ب هەڤلێرێدا هاتم.**

**پێشبەندی (بو، بۆ):** ئەم پێشبەندە بۆ دەستنیشانکردنی شوێن بەکاردێت و بەرانبەر بە (بۆ) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، هەروەها ئەم پێشبەندە زۆرجاران شێوەی خۆی دەگۆڕێت و دەبێت بە (بو)، وەک:

**- کێ فراڤینێ بو مە بەرهەڤدکەت؟[٣]**

**- مە دیارییەکا جوان بو وێ کڕی.**

**- دراڤێ سپی، بۆ ڕۆژا ڕەشە.**

---

١. ئازاد ئەمین فەرەج باخەوان، پێشبەند و پاشبەند لە هەردوو دیالێکتی کرمانجی خواروو و ژوورووی زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، بەشی کوردی، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)، زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٣، ل ١١١.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل ١١٠.

٣. صادق بهاءالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی – کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری، چاپا یەکێ، زانکۆی سەلاحەدین، چاپخانەی (دار الشؤون الثقافیة العامة)، ١٩٨٧، ل ٢٥٥.

- دونیا هەر ڕۆژەکێ بۆ ئێکییە.

وا ڕێکدەکەوێت پێشبەندی (بۆ / بو) لەگەڵ پێشبەندی (ژ) یەک دەگرن و قاڵبی (ژبۆ) دروست دەکەن[1]، وەک:

- خەڵک ژبۆ ناڤێ سەرخوەبوونێ شەڕدکن[2].

**پێشبەندی (ە):** ئەم پێشبەندە لە دوای کار دێت و پێوەی دەلکێت، و بەرانبەر. بە پێشبەندی (ە) لە کرمانجی ناوەڕاست دەوەستێ، وەک:

- ماسیڤان تۆرا خوە ئاڤێتە بن بەحرێ[3].

- مە گهیشتینە سەر روباری قەدەرێ.

**پێشبەندی (تا):** ئەم پێشبەندە شێوەی تریشی هەیە و لە شێوەی (هەتا، حەتا، هەیانی، حەیا...) خۆی دەنوێنێ[4]، هەروەها ئەم پێشبەندە وەک پێشبەندی (تا)یە لە کرمانجی ناوەڕاست، وەک:

---

١. ئازاد ئەسین فەرەج باخەوان، پێشبەند و پاشبەند لە هەردوو دیالێکتی کرمانجی خواروو و ژوورووی زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، بەشی کوردی، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)، زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٣، ل ١٢١.

٢. ک.ک.کوردۆییڤ، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، ل ٣٣٥.

٣. هەمان سەرچاوە، ل ٣٣١.

٤. ئازاد ئەمین فەرەج باخەوان، پێشبەند و پاشبەند لە هەردوو دیالێکتی کرمانجی خواروو و ژوورووی زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، بەشی کوردی، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)، زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٣، ل ١٣١.

- **ل ڤی بایی دچوون حەیا شەڤ گهشتە وەختا نمێژا شیڤانە[1].**
- **هەتا سبەهێ دنڤم.**
- **ئەز حەتا هەڤلێرێ چوومە.**

**پێشبەندی (بێ):** ئەم پێشبەندە بەرانبەر بە پێشبەندی (بێ)یە لە کرمانجی ناوەڕاست، وەک:

- **بێ پارە، خو راناگرم[2].**
- **مار بێ ژەهری نینە.**

---

١. مەمێ ئالان، کۆکردنەوەی صالح عەلی گوللی، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٦١.

٢. صادق بهاءالدین ئامێدی، ڕێزمانا کوردی – کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری، ل ٤٢٧.

# ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشتکردن

**ئامرازی سەرسوڕمان**

ئەو ئامرازانەن کە ڕستەی سەرسووڕمانی دروستدەکەن، ڕستەی سەرسوڕمانیش ئەو ڕستەیەیە کە قسەکەر واتە کەسی یەکەم هەستی خۆی بەرانبەر دەوروبەر دەردەبڕێ، ئەم هەست دەربڕینەش بۆ هەردوو حاڵەتی خۆشی و ناخۆشی بەکاردێت.

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێک ئامراز و وشەمان هەیە، کە ئەویش بۆ مەبەستی سەرسوڕمان بەکاردێن، کە بەسەر دوو گروپ دابەش دەکرێن، بەم شێوەیە :

١. ئامرازی سەرسوڕمان بۆ حاڵەتی خۆشی **(ئافەرین، ئۆخەی، ئۆخەیش، هەربژی........)**.

**- ئافەرین! تە گۆلەک تۆمارکر.**

٢. ئامرازی سەرسوڕمان بۆ حاڵەتی ناخۆشی **(ئاخ، ئۆف، پەکو، پەکوف، ئای، ئۆف، ئۆخ، مخابن.........)**.

**- مخابن! جارەک دن تە نابینم.**

لە زمانی کوردیدا ڕستەی سەرسوڕمان بە دوو شێواز دروست دەکرێت:

لە شێوازی یەکەمدا وشەی سەرسوڕمان لە ڕستەکەدا دەبینرێت، لەم حاڵەتەشدا نیشانەی سەرسوڕمانی (!) دەکەوێتە دوای وشەکەوە و نیشانەی(.) لە کۆتایی ڕستەکەدا دادەنرێت، ئامرازەکانیش بریتین لە: (**وەی، ئای، ئاخ، ئۆف، مخابن، ئافەرین، بژی، ئۆخ، ئۆی، .........هتد.**)، وەک:

**ـ وەی! کاوە دەڤ و دەڤ کەڤت.**

**ـ مخابن! دگەل مە نەهات.**

**ـ ئای! چەندی ماندی بووم.**

**ـ ئۆی! ڤێرێ چەند جهەکێ خۆشە.**

**ـ ئۆف! ئیرۆ گەلەک سارە.**

**ـ ئۆخ! ئەم ژ دەستێ دەرەبەگان ڕزگاربووین.**

لە شێوازی دووەمدا وشەی سەرسوڕمان لە ڕستەکەدا نابینرێت، ئەمجۆرەیان لەڕێگەی (ئاواز)ەوە دروست دەکرێن، لەم حاڵەتەشدا نیشانەی سەرسوڕمانی (!) دەکەوێتە کۆتایی ڕستەکەوە، وەکو :

**ـ ئەڤ خانییە گەلەک جوانە!**

**ـ ئاڤان وەکی گولێیە!**

جێگەی ئاماژەپێکردنە، کە لە زمان بەگشتی و لە زمانی کوردی بەتایبەتی، دوو دیاردە دەبینرێت، کە ئەوانیش (هێز) و (ئاواز)ن،

مەبەست لە هێز ئەوەیە کە پاڵەپەستۆ و هێزێک دەچێتە سەر برگەیەک لە برگەکانی وشە، واتە دیاردەیەکی وشەسازییە. مەبەستیش لە ئاواز ئەوەیە کە پاڵەپەستۆییێک دەخرێتە سەر وشەیەک لە وشەکانی ڕستە، واتە حاڵەت و دیاردەیەکی ڕستەسازییە، ئەم دوو حاڵەتەش (هێز، ئاواز) لە زمانناسی نوێدا دەچنە ناو چوارچێوەی پراگماتیکەوە، چونکە دەبێ هەردوو لایەنی قسەکەر و گوێگر هەبێ ئینجا ئەنجام دەدرێت.

**ئامرازی بانگکردن(بانگهێشتکردن)**

بەو ئامرازانە دەوترێت، کە لە ڕستەی بانگکردندا دەبینرێن، مەبەست لە ڕستەی بانگکردن بەو ڕستانە دەوترێت، کە لایەنی بانگکردنی تێدایە، واتە ئامرازێک لە ئامرازەکانی بانگکردن یان نیشانەیەک لە نیشانەکانی بانگکردن دەبینرێ.

لە کرمانجی سەروودا، چەندین نیشانە بە ناو دەلکێن، بەهۆیەوە ڕەگەزی ناوەکە دیاری دەکرێت، نیشانەکانیش بریتین لە :

ا۔ نیشانەی (ۆ) بۆ تاکی نێر بەکاردێت، وەک:

- کورۆ، بخوێنە داسەرکەڤی.

لە هەمان کاتیشدا دەشێ لە کرمانجی سەروودا، نیشانەی(ۆ) بکەوێتە سەر نیشانەی(ین)ی کۆ و بۆ هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ بەکاربهێنرێت، وەک:

- **هۆ کورینۆ.**

**هۆ کچینۆ.**

ب - نیشانەی (ێ) بۆ تاکی مێ بەکاردێت، وەک:

- **خویشکێ، چێلێ بدۆشە.**

ج - نیشانەی (**ینە**) بۆ کۆی نێر و مێ بەکاردێت، وەک:

- **کورینە ڤان کاران نەکەن.**

لەپاڵ نیشانەکانی بانگکردن، چەندین وشە و ئامڕاز بۆ مەبەستی بانگکردن بەکاردێن، لەوانە:(**ئەی، هۆ، هێی .....**). وەک:

- **ئەی کچینە، هون وەرن ژبۆ مالا مە.**

- **هۆ کچێ.**

- **هۆ حەسەنۆ.**

# بکەر نادیار

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێک پێناسە بۆ بکەرنادیار هەیە، کە هەر هەموویان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، لەناو ڕستەدا تەنیا ونبوون و دەرنەکەوتنی بکەرە، ئەم دیاردەیەش تەنیا لە زمانی کوردیدا بەم شێوەیە نییە، بەڵکو لە هەموو زمانانی دنیا بە هەمان دەستووردا دەڕوات ((دەستووری گشتی هەموو زمانێک لە گۆڕینی ڕستەیێکی کارا دیار بۆ کارا بزر بریتییە لە دەرهاویشتنی کارا و سپاردنی ئەرک بە بەرکار (بەڵام بەرکار هەمان ئەرک و مەفهوومی خۆی دەمێنێ) ))[1].

یاساکانی سازکردنی بکەر نادیار لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا لەگەڵ کرمانجی ناوەڕاست جیاوازە، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١- بکەر و ئەوەی پەیوەندی بە بکەرەوە هەیە لای دەبەین.

٢- بەرکاری ڕاستەوخۆ دێتە شوێنی بکەر و هەر بە بەرکاری ڕاستەوخۆ دەمێنێتەوە.

٣- چاوگی کار وەردەگرین.

٤- کاری یاریدەدەری (هاتن) وەردەگرین :

أ- بۆ کاری ڕابوردوو (هاتە) بەکاردێت، بەم شێوەیە:

---

[1] ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، ڕێزمانی کوردی، کردار، ل ٣٢٣.

**أ. بۆ ڕابوردووی نـزیک هاته + چاوگ**

**ب - بۆ ڕابوردووی بەردەوام دهاته + چاوگ**

**جـ - بۆ ڕابوردووی تـەواو هـاتییە + چاوگ**

**د - بـۆ ڕابوردووی دوور هاتبوو + چاوگ**

ب - بۆ كاری ڕانەبوردوو، بـەم شـێوەیە:

**أ. بـۆ كاتی ئێستا دهـێتە + چاوگ**

**ب - بۆ كاتی داهاتوو دێ هێتە + چاوگ**

لێرەدا چەند ڕستەیەک لە بکەردیارەوە دەگۆڕین بۆ بکەرنادیار:

**١. ئـازادی سێڤ خـار.**

سێڤ هـاتە خارن. ڕابوردووی نزیک

سێڤ دهاتە خارن. ڕابوردووی بەردەوام

سێڤ هاتییە خارن. ڕابوردووی تەواو

سێڤ هاتبوو خارن. ڕابوردووی دوور

سێڤ دهێتە خـارن. ڕانەبوردووی ئێستا

سێڤ دێ هێتە خارن. ڕانەبوردووی داهاتوو

**٢. وی چـا گەرمکر.**

چـا هاتە گەرمکرن. ڕابوردووی نزیک

چـا دهاتە گەرمکرن. ڕابوردووی بەردەوام

| | |
|---|---|
| چـا هاتییە گەرمکرن. | ڕابوردووی تەواو |
| چـا هاتبوو گەرمکرن. | ڕابوردووی دوور |
| چـا دهـێتە گەرمکرن. | ڕانەبوردووی ئێستا |
| چـا دێ هێتە گەرمکرن. | ڕانەبوردووی داهاتوو |

**٣ـ نەسرینێ نامـە نڤیسی.**

| | |
|---|---|
| نـامـە هاتە نڤیسین. | ڕابوردووی نزیک |
| نـامـە دهاتە نڤیسین. | ڕابوردووی بەردەوام |
| نـامـە هاتییە نڤیسین. | ڕابوردووی تەواو |
| نـامـە هاتبوو نڤیسین. | ڕابوردووی دوور |
| نـامـە دهێتـە نڤیسین. | ڕانەبوردووی ئێستا |
| نـامـە دێ هێتە نڤیسین. | ڕانەبوردووی داهاتوو |

بـۆ حاڵـەتی کـۆ، دەستورەکان بەم شێوەیە دەبێت:

| | |
|---|---|
| **١ـ ڕابوردووی نزیک** | **هـاتنە + چاوگ** |
| **٢ـ ڕابوردووی دوور** | **هاتبوونە + چاوگ** |
| **٣ـ ڕابوردووی تـەواو** | **هـاتینە + چاوگ** |
| **٤ـ ڕابوردووی بەردەوام** | **دهـاتنە + چاوگ** |
| **٥ـ ڕانەبوردووی ئێستا** | **دهـێنە + چاوگ** |
| **٦ـ ڕانەبوردووی داهاتوو** | **دێ هێنە + چاوگ** |

لێرەدا چەند ڕستەیەک لە بکەردیارەوە دەگۆڕین بۆ بکەرنادیار:

١- وان کوڕان زەڤیێن خۆ کێلان.

زەڤی هاتنە کێلان. ڕابوردووی نزیک

زەڤی هاتبوونە کێلان. ڕابوردووی دوور

زەڤی هاتینە کێلان. ڕابوردووی تەواو

زەڤی دهاتنە کێلان. ڕابوردووی بەردەوام

زەڤی دهێنە کێلان. ڕانەبوردووی ئیستا

زەڤی دێ هێنە کێلان. ڕانەبوردووی داهاتوو

٢- وان سێڤێن خۆ خارن.

سێڤ هاتنە خارن. ڕابوردووی نزیک

سێڤ هاتبوونە خارن. ڕابوردووی دوور

سێڤ هاتینە خارن. ڕابوردووی تەواو

سێڤ دهاتنە خارن. ڕابوردووی بەردەوام

سێڤ دهێنە خارن. ڕانەبوردووی ئێستا

سێڤ دێ هێنە خارن. ڕانەبوردووی داهاتوو

## سەرچاوەکان

١. ئازاد ئەمین فەرەج باخەوان(٢٠٠٣)، پێشبەند و پاشبەند لە هەردوو دیالێکتی کرمانجی خواروو و ژوورووی زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، بەشی کوردی، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)، زانکۆی بەغدا.
٢. ئەمیر مستۆ محەمەد(٢٠٠٩)، جێناو لە کرمانجی سەرووی زمانی کوردیدا (لە ڕوانگەی تیۆری دەسەڵات و بەستنەوەدا)، نامەی ماستەر، بەشی کوردی کۆلێژی زمانی زانکۆی سەلاحەددین.
٣ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)(١٩٧٩)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆژی)، بەشی یەکەم (ناو)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا.
٤ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)(١٩٨٧)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی دووەم (جێناو)، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا.

٥ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)(١٩٩٢)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی) بەشی سێیەم (ئاوەڵناو)، کۆڕی زانیاری عێراق/ دەستەی کورد، بەغدا.

٦ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)(١٩٩٨)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی چوارەم (ژمارە و ئاوەڵکردار)، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا.

٧ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)(٢٠٠٠)، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (وشەسازی)، بەشی پێنجەم (کردار)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی.

٨ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)(١٩٩٧)، وتاری کار بەپێی ڕۆنان و چەند سەرنجێک، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٩)، ١٩٩٧.

٩ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)(٢٠٠٤)، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، سلێمانی.

١٠ـ ئەورەحمانی حاجی مارف(د)(١٩٧٦)، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا.

١١ـ ئیبراهیم ڕەمەزان زاخۆیی(٢٠٠٨)، ڕێزمانا کوردی، دەزگای سپیریز بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، دهۆک، چاپخانەی خانی.

١٢- باقێ نازێ(٢٠١٢)، ریزمانا کوردی (تیوری و پراکتیک)، چاپخانەی هەوار، دهۆک.
١٣- تۆفیق وەهبی(١٩٢٩)، دەستووری زمانی کوردی، جیزمی یەکەم، بەغدا.
١٤ــ جەلادەت ئــالی بەدرخــان(٢٠٠١)، ئەلفابێیــا کــوردی و بنگەهــێن گــرامەرا کورمــانجی، ڤەگوهاســتن ژ تیپــێن لاتینــی: مەسعود خالد گولی، چاپخانەی خەبات، دهۆک.
١٥- دلبرین عەبدوللا عەلی(٢٠١٢)، جوداکرنا کارێ لێکدای ژ کارێ خودان تەواوکەر و بەرکار، چاپخانەی هەوار، دهۆک.
١٦- دولبەر ئیبراهیم فەرەج شاڵی(٢٠٠٠)، یاسای دەنگییەکانی زمانی کوردی، نامەی ماستەر، بەشی کوردی - کۆلیژی زمان - زانکۆی سلێمانی.
١٧ــ ڕەشــید کــورد(٢٠٠٨)، رێزمانــا زمــانێ کورمــانجی، و: ئیسماعیل تاهـا شـاهین، دەزگـای سـپیرێز، چاپخـانەی خـانی، دهۆک.
١٨ــ ڕەفیــق محێــدین شــوانی(د)(٢٠٠٨)، ئەو وشـــانەی لە چاوگەوە وەردەگیـرێن، دەزگـای تـوێژینەوە و بڵاوکـردنەوەی موکریانی، چاپخانەی خانی، دهۆک.
١٩- ڕەفیق محێدین شوانی(د)(٢٠٠٤)، ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، دەزگای سەردەم، سلێمانی.

٢٠. ساموێل ئودلی ڕەی(٢٠٠٧)، زمانێ کوردی – دڤۆکێ هەکاریا – گرامەر – فەرهەنگ، و: ڕۆژان حازم، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
٢١ـ سەلوا فەریق سالح(٢٠٠٩)، کاری داڕێژراو لەنێوان کوردی (دیالێکتی ژووروو) و فارسیدا، دەزگای سپیرێز، چاپخانەی خانی، دهۆک.
٢٢ـ سعید صدقی کابان(١٩٢٨)، مختصر صرف ونحوی کوردی،جزء ١، چاپخانەی نجاح، بەغدا.
٢٣. سەلام ناوخۆش و نەریمان خۆشناو(٢٠٠٩)، زمانەوانی، بەرگەکانی(یەکەم و دووەم و سێیەم)، چاپخانەی منارە، هەولێر.
٢٤ـ صادق بهاءالدین ئامێدی(١٩٨٧)، ڕێزمانا کوردی – کرمانجی یا ژۆری و ژێری یا هەڤبەرکری، چاپا یەکێ، زانکۆی سەلاحەدین، دار الشؤون الثقافیة العامة.
٢٥ـ عبدالله شالی(١٩٧٦)، ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگ و بۆ فرمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی(دار الجاحظ)، بەغدا.
٢٦. عەبدوللا حوسێن ڕەسول(د)(١٩٩١)، ناکردن لەکوردیدا نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەدین.
٢٧. عەبدوللا حوسێن ڕەسوڵ(د)(٢٠٠٦)، پوختەیەکی وردی ڕستەسازی کوردی، چاپی دووەم، کتێبفرۆشی سۆران، چاپخانەی منارە، هەولێر.

٢٨ـــ عەبـــدوڵڵا حوســـێن ڕەســـووڵ(١٩٩٥)، مـــۆرفیمە ڕێزمانیەکانی کار، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)، زانکۆی بەغدا.
٢٩ـ عەبدولسەلام نەجمەدین و سەلوا فەریق(٢٠١٠)، ڕێزمانا کوردی بۆ زارۆکان، دەزگای سپێریز، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
٣٠ـ عومەر مەحموود کەریم(٢٠٠٤)، کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ لە زمانی کوردیدا، نامەی ماجستێر، بەشی کوردی کۆلیژی پەروەردە (ئیبن ڕوشد)ی زانکۆی بەغدا.
٣١ـــ فاضل عـومەر(٢٠٠٤)، ئـاوەرەک د زمـانێ کـوردی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.
٣٢ـ قەیس کاکل تۆفیق(١٩٩٥)، جۆرەکانی ڕستە و تیۆری کردە قسەییەکان، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین.
٣٣ـ ڤیان ئیبراهیم عەلی(٢٠٠٨)، تایبەتیێن هەڤالناڤی د زمانێ کوردیدا (دیالێکتا سەری ـ گوڤەرا بەهدینی)، نامەی ماستەر، بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی دهۆک.
٣٤ـ ک.ک.کوردۆیێڤ(١٩٨٤)، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، و: کوردستان موکریانی، هەولێر.
٣٥ـ لیژنەی زمان و زانستەکان(١٩٧٦)، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا.

٣٦. لیژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە(٢٠٠٧)، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی دووەمی ناوەندی، چاپخانەی ئارام، بەغدا.
٣٧. لیژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە(٢٠٠٧)، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی سێیەمی ناوەندی، چاپخانەی ئارام، بەغدا.
٣٨. لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە(٢٠٠٩)، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی، چاپی سێیەم، چاپخانەی (ئەکاسیا)، هەولێر.
٣٩ـ لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەوردە(٢٠١٠)، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی، چاپی چوارەم، چاپخانەی (مستقبل)، لوبنان.
٤٠. لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە(٢٠١٠)، زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی دەیەمی ئامادەیی، چاپی چوارەم، چاپخانەی (مستقبل)، لوبنان.
٤١. مزگین عەبدولڕەحمان ئەحمەد(٢٠٠٦)، دۆخی ئێرگەتیڤ لە زمانی کوردیدا (کرمانجی سەروو)، نامەی ماستەر، بەشی کوردی کۆلێژی پەروەردە بۆ زانستە مرۆڤاتییەکانی زانکۆی سەلاحەددین.
٤٢ـ مەمێ ئالان، کۆکردنەوەی صالح عەلی گوللی، بەغدا، ١٩٧٧.
٤٣ـ محەمەد عومەر عەول(٢٠٠١)، دابەشبوونی کرداری لێکدراو لە ڕووی دارشتن و ئەرکەوە (لە کرمانجی خواروو)دا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سلێمانی.

٤٤ــ محەمەد مەعروف فەتاح(د)(١٩٨٩)، کارو پۆلێن کردنەکانی بەپێی ڕۆنان، گۆڤاری ڕۆشنبیری نویێ، ژمارە (١٢١)، ١٩٨٩.
٤٥ـ محمد طاهر گوهەرزی(١٩٩٩)، ڕێزمانا کوردی ـ زارێ کرمانجی، چاپخانەی خەبات، دهۆک.
٤٦ــ مصطفی محمد زەنگنه(١٩٨٩)، کار و ئەرکی له سینتاکسدا، نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەددین.
٤٧ـ نەسرین فەخری(د)(١٩٧٤)، پاشگری (اندن) له زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، بەغدا.
٤٨ــ نەسرین فخری(د) و کوردستان موکریان(د)(١٩٨٢)، ڕێزمانی کوردی،چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر.
٤٩ـ نووری عەلی ئەمین(١٩٦٠)، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی.
٥٠ـ نووری عەلی ئەمین(١٩٥٦)، قەواعیدی زمانی کوردی، له (صرف و نەحو)دا، بەرگی یەکەم، چاپخانەی مەعارف، بەغدا.
٥١ـ نووری عەلی ئەمین(١٩٥٨)، قەواعیدی زمانی کوردی، له (صرف و نەحو)دا، بەرگی دووەم، چاپخانەی مەعارف، بەغدا.
٥٢ــ نەریمان عەبدوللا خۆشناو(٢٠٠٧)، بکەر نادیار، سەنتەری ڕوناکبیری هەتاو، هەولێر، چاپخانەی شەهاب.

٥٣ــ نەریمــان عەبــدوڵڵا خۆشــناو(٢٠٠٥)، کــاری تیــپەڕ لێکۆڵینەوەیەکی بەرانبەرییە لە نێوان زمانی کوردی و زمانی عەرەبیدا، گ . کاروان، ژ. (١٩٨)، ٢٠٠٥.
٥٤ـ نەریمـان عەبـدوڵڵا خۆشـناو(٢٠٠٩)، ڕێزمـانی کـوردی، چاپخانەی منارە، هەولێر.
٥٥ـ نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو(٢٠١٢)، ڕێزمـانی کـوردی - کرمــانجی ناوەڕاســت و کرمــانجی ســەروو، چاپخــانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.
٥٦ــ نەریمــان عەبــدوڵڵا خۆشــناو(٢٠١٢)، ڕستەســازی، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر.
٥٧ـ وریـا عـومەر ئەمـین(٢٠٠٤)، ئاسـۆیەکی تـری زمـانەوانی، دەزگای ئاراس، هەولێر.
٥٨ـ وریا عومەر ئەمین(د)(١٩٩٧)، ڕەخنەی ناڕەخنە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٤٠)، ١٩٩٧.